وتاری بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر

ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی لە کۆنگرەی یەکەم دا





# کار و پرۆژەی ئیسلامیی مان

## ئاوڕدانەوەیەك لە ڕابردوو

## سەرنجدانێکی واقیعی ئێستامان.

## لە داهاتوودا چی بکەین و چۆن بکەین؟!

وتــاری بەڕێــز مامۆسـتا عەلــی باپیـر
ئەمـیـری كۆمـەڵی ئیسـلامـیی لـە كۆنگـرەی یەكـەم دا

# كـار و پرۆژەی ئیسلامیی مان

1- ئاوڕدانەوەیەك لە ڕابردوو.
2- سـەرنجدانێكـی واقیعـی ئێسـتامان.
3- لە داهاتوو دا چی بكەین و چۆن بكەین؟!



1427ك –

# پێشـــكەش بێ

به ســەرجەم دۆست و لایەنگرە ئیشكەر و مشورخۆر و دڵسـۆز و لێبــڕاوەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی،بە دێرین وتازە ودرشت و وردەوە.

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir  /MediaAmeerOffice
www.alibapir.net



﴿ قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُـو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِـيرَةٍ أَنَـا وَمَنْ اتَّبَعَـنِي وَسُـبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَا مِنْ الْمُشْـرِكِينَ ﴾

(يوسف –108)

ameer.maktab@yahoo.com










www.alibapir.net

**ئەم نامیلکـەیە :**
**بەڕێــزان ...**
**ئەندام و لایەنگرانی کۆمەڵی ئیسلامیی !**

ئەم نامیلکەیەی بەر دەستتان بریتییە لەو دوو وتارەی کە بەندە لە سەرەتا و کۆتایی یەکەمین کۆنگرەی (کۆمەڵی ئیسلامیی)دا پێشکەشی ئەندامانی کۆنگرەم کردن[1]و، هەوڵم داوە سەرجەم دید و بۆچون و ڕێڕوونی و ئاڕاستەکانی خۆمیان - کە بۆ ئەم قۆناغ و هەل ومەرجەی ئێستای کارو پڕۆژەی ئیسلامیی مان پێویستن – تێدا بخەمە ڕوو.

بۆیە بە پێویســتی دەزانم و لە سەرتانی پێویست دەکەم کە هەر کامێکتان زۆر بە وردی تێبینی بکاتو بە نێوەڕۆکەکەشیەوە پابــەند بێ و ڕەفتاری پێ بکاتو دەوروبەری خۆیشی پێ پەروەردە بکات .

دڵنیاشم هەرکەسێك نێوەڕۆکی ئەم نامیلکەیەو نامیلکەی: (بنەما شەرعییەکانو هێڵــە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی) باش فام بکات و هەزم بکات بە تەواوی بەرچاوی ڕۆشــــــن دەبێتەوە لە بارەی بەرنامەی فیکریــیو پەروەردەیی و سیاسیی کۆمەڵ و دەزانێ کە ئێمە (کۆمەڵی ئیسلامیی) کێین و چین و چی دەکەین و چیمان دەوێ ؟!![2]

لە خوای بەخشەر و بە بە بەزەییش دەپاڕێمەوە کە هەقمان بە هەق و ناهەقمان بە ناهەق بخاتە بەر چاوو پێ بناسێنێ و یارمەتیشمان بدات کە بەهەقەوە پابەند ببین و لە ناهەق دوور بین و لەسەرجەم هەنگا وو هەڵوێست و هەلس و کەوتەکانی ژیانی تاکیی و خێزانی و کۆمەڵایەتیمان دا .

ڕۆژی جومعە (19)ی ڕەبیعی دووەمی (1427)ی کۆچی
(21)ی مایسی (2006)ی زایینی
هــەولێر

---

(1) کە لە ڕۆژانی ( 9 و 10 و 11 ) مانگی ( 11 ) ساڵی ( 2005 ) بەسترا .
(2) سوپاسیش بۆ برای بەڕێزمان کاك مەلا بیـلال – بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندنی مەکتەبی ئەمیر – کە هەردوو وتارەکەی لە کاسێتەوە هێنایە سـەر کاغەز .

# وتــاری ســەرەتای كۆنگرە

بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه،ونعوذ بالله من شرور انفسنا و من سيئات اعمالنا، من يهده الله فهو المهتد ومن يضلل فلا هادي له، واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له واشهد ان محمداً عبده و رسوله ﴿يَاأَيُّهَا الَذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾، ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَتَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾،﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾

امّا بعد فأن اصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد ﷺ و شر الأمور محدثاتها، ان كل محدثة بدعة، و كل بدعة ضلالة، و كل ضلالة في النار.

بەڕێزان ئەندامانی یەكەمین كۆنگرەی (كۆمەڵی ئیسلامیی) برایان، خوشكان !، (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته)پیرۆزبایی گەرم وگوڕ لە خۆم و لە هەموو لایەكتان دەكەم بە بۆنەی گرێدانی یەكەمین كۆنگرەمانەوە، وە لە خوای گەورە داواكارم ئەم كۆنگرەیەمان- كە وەك پێشتر گوتومانە هەرجۆرە كۆبوونەوەیەكی مسوڵمانان كە بە زاراوی هاوچەرخ چ ناوی لـێ بنرێ (كۆنگرە) چ (كۆنفرانس) چ (كۆبوونەوەی گشتی) چ (كۆبونەوەی سەركردایەتی)لە هەر

ئاستێك دابێ، هەموو كۆبوونەوەكانی مسوڵمانان بریتین لە پراكتیزە كردنی فەرمایشتی خوای كاربەجێ كە دەفەرموێ: (وامرهم شورى بينهم) واته: كاروباری ئەهلی ئیمان بە ڕاوێژە، بە لێكۆڵینەوەو پرس و ڕا بە یەكترکردنە جا لە خوای بەرز و مەزن داواكارم كە ئەم كۆنگرەیەمان و پرس و ڕا بە یەكتر كردنەمان وا لـێبكات كە بەرەكەت دار بێ و بە شێوەیەك بێ كە لە لای خوای بە بەزەیی قبووڵ بێ، وە بۆ بەندەكانی خوا بەرهەمدار بێت، بێگومان هەر كارو كردەوەیەكیش وابوو كە لە لای خوا مەقبوڵ بێ، بۆ بەندەكانی خوا و خەڵكی خواش بەسوود دەبێت، ئینجا كارێكێش لای خوا وەرگیراوە كە لە سەر بناغەی تەقوا و پارێز بنیات نرابێ، بۆیە ئومێدم وایە هەر كام لە ئێمەو بە كۆمەڵیش هەموومان بناغەی ئەم كارەمان ، بناغەی ئەم كۆبوونەوەو كۆڕ و كۆنگرەیەمان بریتی بێ لە پارێزكاریی و هەوڵدان بۆ خوا لە خۆ ڕازی كردن، خوای بەخشەریش بەڵێنی داوە كە كار و كردەوەی ئەهلی تەقوا قبوڵ دەكات، وە تەنیا كارو كردەوەی ئەهلی تەقواش قبوڵ دەكات وەك دەفەرموێت:﴿قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنْ الْمُتَّقِينَ﴾ (المائدة –27) وە بەر لەوەی بێمە سەر وتارەكەم لە خوای بەخشندە دەپاڕێمەوەو دەڵێم: خوایە بە ناوەچاكەكانت و بە سیفەتە هەرە بەرزو پەسندەكانت لێت دەپاڕێینەوە كە پلە و پایەی شەهیدەكانمان بەرزو بەرزتر بكەی خوایە بە لوتف وكەرەمی خۆت زیاتر لەوان ڕازی بی، پلەكانیان زیاتر بەرز بكەیەوە، وە ئەو خوێنەش كە ئەوان ڕشتوویانە بەرەكەتی زیاتری تێ بخەی بۆ كاری ئیسلامیی مان، وە پاداشتی چاكتریش بدەیەوە بە هەموو لایەكمان وبە تایبەتیش بە كەسوكاریان، وە سێبووریی و ئارامیی و سەكینەتی زیاتریش بەسەر دڵی هەموو لایەكماندا بڕێژی، وە ئیمەش یارمەتی بدەی كە درێژە بەو ڕێبازە بدەین كە ئەوان گیانی خۆیانیان لە پێناودا بەخشی كە بریتییە لە ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوا محمد المصطفى ﷺ، وە خوایە لێت

دەپاڕێینەوە بە ناوە هەرە چاکەکانت و سیفەتە هەرە بەرز و پەسندەکانت کە لە کەم و کوڕییەکانمان ببووری، وە عەیب و ناتەواویەکانی خۆمانمان پێشان بدەی وە یارمەتیمان بدەی کە ئێســتا و داهاتوومـان لە ڕابردوومان چاکتر و گەش و ڕوونتر بێت ﴿ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ (البقرة 286 )
آمـين .

بەڕێزان مـن وتارەکـــەی خۆم لەژێر ناوونیشــــــانی:
(کارو پرۆژەی ئیسلامـیـی‌مـان ... رابردووو ئێستا و داهاتووی)دا پێشکەشی ئێوەی بەڕێز دەکەم .
وە وتارەکەم کردوە بە سێ تەوەرە :
یەکەم : ئاوڕدانەوەیەك لە ڕابردوو.
دووەم : سەرنجدانێکی واقیعی ئێستامـان .
ســێیەم : لە داهاتوودا چی بکەین چۆن بکەین ؟

# تەوەرەی یەکەم: ئاوڕدانەوەیەك لە ڕابردوو

بەڕێزان ژیانی هەرئینسانێك، وە ژیانی هەر کۆمەڵێك و میللەتێك دابەش دەبێت بۆ سێ قۆناغ، قۆناغێك کە رابواردوەو گوزەراندوویەتی و تێپەڕ بووە، وە قۆناغێك کە ئێستا تێیدایە و، قۆناغێکیش کە دادێت .

دیارە ئەو سێ قۆناغە کاریگەرییان لەسەر یەکتر هەیە، رابردوو کاریگەری هەیە لەسەر ئێستا، ئێستاش بناغەیە بۆ داهاتوو، بیر کردنەوە لە داهاتووش کار لە ئێستا دەکات، هەرکەسێك نەزانێ لە ڕابردوو دا چی کردوە نازانێ ئێستاش چی بکات ! وە نازانێ بۆ سبەینێش چی بکات و چۆن بکات !

لەبەر ئەوە پێویستە ئێمە وەك (کۆمەڵی ئیسلامیی) چاوێکی جیددی بە رابردووی خۆمان دا بگێڕینەوە، دیارە من لێرەدا نامەوێ بچمە ناو درێژە (تفاصیل) ی وردەکارییەکانی ڕابردوومان، نە کاتەکە دەرفەت بەوە دەدات وە نە پێویستیش دەکات، بەڵکو بەشدار بووانی بەڕێز دەتوانن قسە لەسەر هەر بابەت و وردەکارییەك بکەن ئەگەر پێویستی کرد، من لە چەند خالێکی سەرەکی دا کە (7) خاڵن ئاماژە بۆ ئەو مەسەلەیە دەکەم و ئاوڕدانەوەو چاوپێداگێڕانەوەی ڕابردوومان دەخەمە ڕوو:

## خاڵی یەکەم : ڕەگ و ریشەی مێژوویی مان :

بەڵێ کۆمەڵی ئیسلامیی لە ڕۆژی ( 31 / 5 / 2001 ز) بە ناوی کۆمەڵی ئیسلامیی‌یەوە خۆی ئیعلان کرد، بەڵام هەموو لایەك دەزانین کە (کۆمەڵی ئیسلامیی) ئەو کاتە لە دایك نەبوو و پەیدا نەبوو کە ناوی لە خۆی نا (کۆمەڵی ئیسلامیی) بەڵکو ڕەگ و ریشەیەکی دوور و قووڵی هەیە لە مێژووی کار و پڕۆژەی ئیسلامیی کە لە کوردستان دا بووە.

یەکەمین ڕەگ و ریشەی کار و چالاکی (کۆمەڵی ئیسلامیی) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (1978 ز) کە بۆ یەکەمین جار وەك نێوکێکی ڕێکخراوەیی (نواة تنظیمیة) جم و جۆڵێك پەیدا بوو کە دواتر ناوی لێنرا (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی/ حـــرکة الرابطـــة الاسلامیة) وە بەشێك لەوانەی کە ئێستا هەن لەم (کۆمەڵی ئیسسلامیی)یەدا خەڵکی ئەو کاتن، چ لە ئاستی قیادە دابن، چ لە ئاستی کادیر و ئەندامان دابن، کەسانێکن کە لەو کاتەوە لەگەڵ ئەم کاروانە ئیسلامییەدا بوون.

ئەوە لە قۆڵێکەوە، لە قۆڵی دیکەشەوە ئەوە بوو کە (بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی) لە ساڵی (1987) ناوەکەی گۆڕدرا بۆ (بزووتنەوەی ئیسلامیی/ الحرکة الاسلامیة) دوای ئەوەی کە ژمارەیك خەڵکی دیکەی هاتە نێو لە سەرجەم شارو ناوچەکانی کوردستانەوە.

دواتر لە ساڵی (1999ز) ئەوە بوو کە بزووتنەوەی ئیسلامیی لەگەڵ (بزووتنەوەی ڕاپەڕینـــی ئیســـلامیی) کە ئەویش لە ساڵی (1992ز)دا ڕاگەیەنرابوو، وە پێشتر بەشێك بوو لە (برایانی مســـوڵمان/ الاخـــوان المســلمون)، بەڵێ جا هـــەردووك بزووتنەوەی ئیسلامی و بزووتنەوەی ڕاپەرینی ئیسلامیی یەکیان گرت و (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی) پێکهات کە لە مانگی (8) ی ساڵی (1999) دا ئیعلان کرا .

پاشان لە یەکەمین کۆنگرەی (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیســـــلامیی)دا کە ئەویش لە مانگی (8) ی ساڵی (2000)ز لە تەوێڵە دا بەسترا، (کۆمـــەڵی ئیسلامیی) ئێستای لـێ پێکهات .

کەواتە لە ڕاستی دا (کۆمەڵی ئیسلامیی) ڕەگ و ریشەکەی قووڵ بۆتەوە، چ وەك ئەو ڕەوتەیان تەماشای بکەین کە زیاتر ناوی جیهادیی و لایەنی چەکداریی لێنراوە هەرچەندە ئەو ڕەوتەش کاری ڕێکخراوەیی و ڕاگەیاندن و کۆمەڵایەتی و کاری سیاسیی و دیبلۆماسیشی هەر کردوە، وە چ

ڕەوتەکەی دیکە کە وەك ئاماژەم پێکرد بەشێك بوو لەو جم و جۆڵەی کەلە کوردستان دابوو بە ناوی (برایانی مســـــوڵمان)، ماناى وایە (کۆمـــەڵی ئیسلامیی) ڕەگ و ڕیشەکەی قووڵە، بەڵێ وەك ناو لە (31/5/ 2001) هاتە ئاراوە، بەڵام وەك نێوەڕۆك و ڕەگ و ڕیشەکەی قووڵ بۆتەوە، واتە لەو ڕۆژەوە لە دایك نەبووە کە ناوی (کۆمەڵی ئیسلامیی)لـێنراوە بەڵکو زۆر لەوە پێش هاتۆتە ئاراوە و ئەسپی خۆی لە مەیدانی دینداریی و کاری ئیسلامیی دا تاو داوە.

## خاڵی دووەم: هــەل و مەرجی ســەرهەڵدان و ئیعـلان کرانی (کۆمــەڵی ئیســـلامیی):

هەموو لایەك ئاگادارین کە لە کۆنگرەی یەکەمی (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی)دا کە ئامانج لە بەستنی ئەوەبوو کە کۆمەڵێك کێشەو گرفت هەبوون لە نێو (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی)دا وە پێشتریش لە نێو بزووتنەوەی ئیسلامیی دا کە پێویست ناکات باسی هیچ کەس بکەم و ناوی هیچ کەس بێنم، بەڵێ جا لە کۆنگرەی یەکەمی (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی)دا بڕیار درا کە هەموو لایەك بە بڕیارەکانی کۆنگرەوە پابەند بین بۆ ئەوەی ئەو گرفت و کێشانەی کە زیاتر ئەوان پالیان پێوە نایین کۆنگرە ببەستین، چارەسەر بکرێن، بەڵام ئەوە بوو دوای دەرکەوتنی ئەنجامەکان هەندێك کەس بەو ئەنجامانەوە پابەند نەبوون وئامادە نەبوون پابەند بن بەو مەرج و بەڵێنانەوە کە هەموومان لەسەریان پێکهاتبووین، بۆیە ئەوە بوو کە ئەو تەوژمە کە زۆربەی هەرە زۆری (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی) ئەوسای پێك دەهێنا چ لەسەر ئاستی قیادە چ لەسەر ئاستی قاعیدە و بنکەکانی هێزی پێشمەرگە و ئۆرگانەکانی ڕێکخستن و کاری جەماوەریی،

خۆیان ناچار بینی کە لە ڕۆژی (2001/5/31) خۆیان ئیعلان بکەن بە ناوی (کۆمەڵی ئیسلامیی) چونکە ئەو کات ئێمە چوار ڕێمان لە پێش بوون جا وەك نوکتەیەکی خۆش بۆتان دەگێڕمەوە: ڕۆژێك لەو سەرو حەددەدا برایەك هات بۆ لام وگوتی: فلان کەس ئێمە سێ (3) ڕێمان لە پێشن، هەستا بە قەڵەمێك سێگۆشەیەکی دروست کرد و گوتی: لایەکی سێگۆشەکە ئەوەیە دابنیشین و واز بهێنین، لایەکیشی ئەوەیە بێ دەنگ بین (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی) بەم شێوەیە بڕوات کە هەیە واتە کارکردن بەبێ پرس و ڕاو بێ بەرنامەیی و بێ سەرەوبەرەیی لایەکەی دیکەشی ئەوەیە جیا ببینەوە!

منیش گوتم: جا کاکە وەك تۆ دەڵـێی ئێمە عاسێ بووین! نەخێر ئێمە بەدیلێکی دیکەی چوارەمان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئێمە دەڵێین ئەوانەی ئامادە نین پابەند بن بە ئەنجامەکانی کۆنگرەوە و بە ئیمزا و بەڵێنەکانی خۆیانەوە ئەوە جیامان کردنەوە! ئێمە هەر لە شوێنی خۆمانین وەك (بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی) ناو لە خۆمان دەنێین کۆمەڵی ئیسلامیی بۆ ئەوەی لەو هەڵەو کەم و کوڕی (سلبیات)یانەی هەبوون بتوانین خۆمانی لێ بەری بکەین، وە لەسەر ناویش مشت و مڕمان نەبێت چونکە گرنگ نێوەڕۆکە، بەڵێ ئێمە لە شوێنی خۆمان دەمێنینەوە و ئەوانەی کە نەگونجان و پابەندی بڕیارەکان نین ئەوانە جیادەکەینەوە ! کە بێگومان دەزانن و ئاگادارن وامان کرد .

## خاڵی سێیەم : بناغەی کاری ( کۆمەڵی ئیسلامیی ) :

ئێمە ئەو کاتەی کە کۆمەڵی ئیسلامیی مان ڕاگەیاند بەڵکو بەر لەوەش ئێمە وەك ئەوانەی کە مشوور خۆر بووین و دەرچووی کۆنگرە بووین هەستاین لە نێو خۆماندا چەندین کۆبوونەوە و وتوویژ و قسەو باسمان ئەنجامدا ئەوەبوو

کە لەسەر (25) خاڵ پێکهاتین، ئەو خاڵانەش دیارە من نووسینم کە لەگەڵ برایانی مشـــوور خۆر و ئەوانەی کە بەتەما بووین بەیەکەوە (کۆمەڵـــی ئیســـلامیی) ڕابگەیەنین دانیشتین و لەســـەریان ڕێککەوتین بە هەندێك دەســـتکاری و سەنگ و سووکی، کە ئەوە بوو خاڵەکان بە ناوی (بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی) بڵاوکرانەوە .

جا ئەوەتان بۆیە بیر دەخەمەوە کە هەموولایەك بزانین (کۆمەڵی ئیسلامیی) کاتی خۆی کە بنیات نرا و ڕاگەیەنرا ، دیارە کۆمەڵێك بناغە و بنچینە هەبوون ئەو خەڵکە لەسەری پێکهاتبوون ئێستاش دەبێ ئەو بناغەو بنچینەو بنەمایانەمان هەر لەبەر چاو بن ، بەڵێ دەتوانین کەم و زیادی و گۆڕانکاری یان تێدا بکەین، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ئەو خاڵانە هەر لە شوێنی خۆیانن تاکو ئەندامانی (کۆمەڵی ئیسلامیی) کە لەم کۆنگرەیەدا بەشـدارن چاویان پێدا دەگێڕنەوە .

## خاڵی چوارەم: ئەو ئاستەنگ و گرفتانەی هاتنە ڕێی (کۆمەڵی ئیسلامیی) و توانی سەربەرزانە هەڵیان بوێرێ :

ئێمە لە ڕابردوودا کۆمەڵێك کێشەو گرفتمان هاتوونە پێش، جـا لێرەدا هەم ئاماژەیەك بەوان دەکەم، هەم بە هەڵوێســـت نواندنی (کۆمەڵـــــــی ئیســـلامیی)ش لە بەرانبـــــــەریاندا، کە پێم وایە تا ئەندازەیەکـــی زۆر هەڵوێستێکی شەرعییانە و ئیجابییانە و سەر ڕاستانە بووە:

1- یەکەمین کێشەمان ئەوە بوو کە دوای ڕاگەیاندنی (کۆمەڵی ئیسلامیی) ئەوانەی نا ڕازی بوون بە ئەنجامەکانی کۆنگرەوە ویستیان گێچەڵمان پێ بکەن، بەڵام ئێمە خۆمان کۆنترۆڵ کرد و، زۆر پشوو درێژانەو بارقوڵانە و دووربینانەو وردبینانە مامەڵەمان کرد، ئەوە بوو توانیمان خۆ بپارێزین لە

بەدەمەوە چوونی ئەو گێچەڵەی کە دەویسترا پێمان بکرێ، وە بەڕاستی من زۆر سوپاسی خوام لەسەر کردوە و دەکەم کە نەمان هێشت لە لای ئێمەوە ئیسلام ناشرین بێت! وە هەمیشەش دەبێ ئەوە هەڵوێستمان بێت چ لە نێوخۆی (کۆمەڵی ئیسلامیی)، چ لەناو خۆمان دا وەك ڕێڕەوی ئیسلامیی لە کوردستان دا، چ وەك نێو کوردستان و عێراق ، هەمیشە هەوڵدەین بارمان بەلادا نەکەوێت .

لە ڕاستی دا ئەوەش دان بە خۆ داگرتن و جوهـدێکی زۆری ویسـت، بیستن و فەرمانبەریی (سمع و طاعة) یەکی زۆر چاك هـەبوو لـە لایـەنی (قاعیدە)وە بۆ (قیادة) کە ئێستاش لەگەڵدابێ من مـەمنوونم لـە بـرا پێشمەرگەکان کە لـە ئازایـەتی و مەردایـەتی یـان کـەم نـەبو، بـەڵام حیکمەت و خۆڕاگریی و فەرمانبەریی چاکیان هەبوو، کە سوپاس بۆ خوا توانیمان ئەو قۆناغە سەخت و دژوار و ناخۆشە سەربەرزانە بگوزەرێنین !

2- دیاردەی سەرهەڵدانی (جند الاسلام ) کە دواتر ناویـان لـە خۆیـان نـا (انصار الاسلام)، بـە ڕاسـتی ئـەوەش گرفـت و کێشـەیەکی نـاخۆش و نارەحەت بوو بۆ ئێمە کە ئەوە بوو دواییش باجی دراوسـێیەتی و نزیکـی ئەوانیشمان هەردا، یاخود چاکتر بڵێین: بەو هۆیـەوە بیانوومـان پـێگیراو بەبێ سوچ و تاوان دەستدرێژیمان کرایە سەر!

بێگومان لەبەرانبەر ئەوەشدا دیسان ئێمە وەك سەرکردایەتی و بنکەی (کۆمەڵی ئیسلامیی) توانیمان باش لەو گرفت و کێشەیەش کە یەخـەی پێگرتین دەربچین و مامەڵەیەکی شەرعییانە و عاقلانە و سەر ڕاسـتانەی لەگەڵ دا بکەین!

بەڵێ خەم و خەفەتی زۆرمان خوارد، نارەحەتی زۆرمان بینی و دواییش باجماندا، بەڵام باجەکە زیاتر دەگەڕایەوە بۆ بیـانوو پێگیرانمـان! ئەگـەرنا

ئەمریکا ئەوەندە گێل نیە کە نەزانێ ئەوە بارەگاو بنکەی (کۆمەڵی ئیسلامیی)ە! بە هەر حاڵ بە بیانووی نزیکی مان لەوان ئەوە بوو مووشەك باران کراین – وەك دوایی باسی دەکەم– بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێمە دیسان لەگەڵ (گروپی ئەنصار) یش دا کە هەمیشە دەستیان لەسەر پەلەپیتکە بوو، زۆر جاران هەڕەشەیان دەکرد و نەزانانە (فَتْوی)ی خراپ خرپیان دژی ئێمە دەردەکرد! ئێمە توانیمان کە دیسان خەڵکی خۆمان کۆنترۆڵ بکەین، وە بەدەم ئەو ئاژاوە و هەرایەوە نەچین کە ئەوان دەیانویست پێمان بگێڕن.

بەڕاستی ئەوەش نیعمەتێکی خوایی بوو، پێویستە سوپاسی خوای لەسەر بکەین، وە خاڵێکی ئیجابی یە کە دەبێ هەمیشە لەبەرچاومان بێت و ئەوە هەڵوێستمان بێ لەگەڵ هەر کەسێکدا کە ئەهلی ئیمان و ئیسلام بێ! بەڵکو ئەگەر ئەهلی ئیسلامیش نەبێ بەڵام لە قازانجی کار و پڕۆژەی ئیسلامیی نەبێ پەنا ببرێتە بەرهێز هەر دەبێ ئەوە هەڵوێستمان بێ کە هەوڵدەین بەدەم کێشەو ئاشووب و ئاژاوەوە نەچین .

3- کێشەیەکی دیکە ئەوەبوو کە بە ڕاستی زوڵم ناهەقییەکی گەورەبوو لێمان کرا ئەوەبوو (مامۆستا عبداللە ی قەصریێ)(3) و چوار کەس لە هاوەڵانی لە بازگەی تاسڵوجە لە (4 / 3 / 2003) بە ناهەق و زوڵم کوژران خوا بە شەهیدی وەرگرتبن، دیارە لایەنی بەرامبەر تا ئێستاش داکۆکی دەکەن لەسەر ئەوە کە هەڵە بووەو بە ئەنقەست نەبووە! بەڵام گرنگ ئەوەیە هەرچۆن بێ زوڵمێك بوو کرا، کە دیسان ئێمە لەوەشدا توانیمان دان بەخۆماندا بگرین، وە لەسەر ئەو دان بەخۆداگرتنەی ئەوکاتیش پەشیمان نین بەڵکو شتێکی زۆر چاکمان کرد! وە ئێستاش من لێرەوە ڕای دەگەیەنم

(3) کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو و پیاوێکی زۆر هەڵکەوتوو و لە دڵی مسوڵمانان دا خۆشەویست بوو.

که لەو ڕۆژانەدا ئەو کێشـەیەمان کۆتـایی پـێ هێنـا بـە پێـك هـاتن (صولّح)، دیسـان ئێمـە ئـەوەش بـە هەڵوێسـتێکی زۆر شـەرعییانە و حەکیمانە و سەر ڕاسـتانەی خۆمـان دەزانـین بۆچـی؟! چـونکە وەك لـە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ )دا گوتبووم : پێغەمبـەر ﷺ دوای ئەوەی کە خوای کاربەجێ یارمەتی دا شاری (مەککە)ی ئازاد کـرد، هـەموو ئەوانـەی کـە هـەتا دوێنـێ هـاوەڵانی بـەڕێزی ئـەویان دەچەوساندەوە، لە ژێر ئازار و ئەشـکەنجەدا دەیانکوشـتن، دیـل کـران و هێنران بۆ لای، پێغەمبەر ﷺ وتاری بۆ دان و فەرمووی: (ماترون أنيّ فاعل بكم ؟) پێتان وایە چیتان لـێ دەکەم؟! ئەوانیش کە تا ئـەو کـات لەسەر بیروباوەڕی بت پەرستانەی خۆیان بەردەوام بوون، نـەیانگوت: تـۆ پێغەمبەری خوای و لێمان ببووره ، بەڵکو گوتیان: (خيراً أخ كريم و ابن أخ كريم ) تۆ برایەکی بەڕێزی و برازایـەکی بەڕێزیشـی، چـاکەت لـێ چاوەڕێ دەکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (اذهبـوا فـأنتم الطلـقاء) بڕۆن ئەو ئازادم کردن، بەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لە لووتکەی دەسەڵاتدا بە بەرژەوەندی ئیسـلام و مسـوڵمانانی زانیـوە کـە دوژمنـەکانی خـۆی هەرچەندە دەستیان بە خوێنی هاوەڵانی سوور بـووە پێیـان بڵـێ: ئـەوە عەفوم کرد! ئێمەش لە هەر قۆناغێکـدا دەسـەڵاتمان هـەبێت یـان نـا، تەماشا دەکەین چی بـۆ کـاری ئیسـلامیمان باشـە، چـی بـۆ میللەتـە مسوڵمانەکەمان و بۆ وڵاتەکەمان باشە چونکە دینی خوا ڕەحمەت و خێرو خۆشی یە بۆ خەڵك، بۆ ئەوە هاتوە خەڵك لە دنیاو دوا ڕۆژدا بەختـەوەر بکات، ئێمە تەماشا دەکەین چ شتێك لە قازانج و بەختەوەری خۆمـان و میللەتمان و وڵاتمان دایە وا دەکەین.

ئەوەش بە ڕاستی هەرچەندە هەندێك خەڵكی بیر كورت غەیری كۆمەڵی ئیسلامی لەوانەیە ئەو هەڵوێستەیان بۆ ئێمە بە هەڵەو (تنازل) تەفسیر كردبێ ! بەڵام بێگومان ئێمە خۆمان لەسەر ڕۆشنایی (بیِّنة) و بەرچاو ڕوونیی (بصیرة) دەبینین و پێمان وایە شتێكمان كردوە خوای پەروەردگار پێی چاكە و پێغەمبەریش ﷺ پێی باشە، چونكە ئەویش هەرواى كردوە لەگەڵ كەسانێك دا كە دژایەتیشیان كردوە بەڵام بەرژەوەندی خەڵك و وڵات و ئاییندەی دینی خوای لەوەدا بینیوە، وە پێشمان وایە خەڵكی خۆمان متمانەی بە قیادەی خۆی هەیەو ئەو هەڵوێستەش بە هەڵوێستێكی حەكیمانە و لێزانانە دەزانێت.

ئینجا ئێمە دەڵێین: چ مامۆستا (عبدالله قەصری) و چوار هاوەڵەكەی خوا بە شەهیدی وەرگرتبێ و پلەیان بەرزو بەرزتر بكاتەوە كە بێگومان مامۆستا عبداللەی قەصریێ كەلێنی زۆر گەورەیە و پیاوێكی زۆر ناوازەو دەگمەن بوو، بەڵام ئەویش و غەیری ئەویش شەهیدەكانی ئێمە و هەموو شەهیدەكانی ئیسلام بەڵكو هەموو ئەوانەی كە لە ئادەمەوە تا كو خاتەم، وە لە خاتەمەوە ﷺ تا دنیا بە كۆتایی دەگات لە پێناوی دینی خوادا روحی خۆیان بەخت دەكەن، بۆ چیە؟ بۆ ئەوەیە كەدینی خوا گەشە بكاتو بەرەو پێش بچێت، دەی كەواتە ئێمەش تەماشا دەكەین چ شتێك بۆ دینی خوا باشە بەو شێوەیە دەكەین و هەڵوێست وەردەگرین.

4- گرفت و كێشەیەكی دیكەی ناخۆش كە بۆ ئێمە هاتبێتە پێش مووشەك (صاروخ) باران كرانی ئێمە بوو لە لایەن ئەمریكاوە لە (20/21 – 3 – 2003) كە ئێمە زیاتر لە (100) كوژراو و بریندارمان هەبوو خوا بە كەرەمی خۆی كوژراوەكانمانی بە شەهید وەرگرتبێ و بە چاكترین شێوەش پاداشتی بریندارەكانمان و كەس و كاری هەموو لایەكیان بداتەوە، كە ئەوەش بە راستی زوڵم و تاوانێك گەورە بوو دەرحەقمان كرا، بیانوو و

گێچەڵێك بوو پێمان گیرا، بەڵام دیسان لەوەش دا ئێمە دانمان بە خۆداگرت، کە بێگومان دەمانتوانی شتێك هەر بکەین و شتێکمان لە دەست دەهات، بەڵام کە تەماشامان کرد زانیمان کە نەخێر زوڵمێکە لێمان کراوەو هەر شتێك بکەین هەرچەندە مەزڵوومین بەڵام ڕەنگە دوایی زاڵم بێینە بەرچاو! وەك کە (عەلی کوڕی أبوطالب )(خوا لێ ی رازی بێ) گوتوویەتی: (ما رأيت مظلوماً أشبه بظالم مني)
واتە : هیچ مەزڵوومێکم نەبینیوە لە من زیاتر وەك زاڵمان بچێت، واتە: مەزڵوومم بەڵام خەڵك وەك زاڵم تەماشام دەکات !.
ئێمەش گوتمان هەر شتێك بکەین، زوڵممان لێکراوە کەچی خەڵك وادەزانێ زوڵممان کردوە، کەواتە: با بێدەنگ بین چاکترە، با زوڵم لێکرانەکە چەند قات نەبێتەوە!
5- گرفتێکی دیکە کە هاتە ڕێمان و زۆر تاڵ و دژوار بوو، ئەوە بوو کە گواستمانەوە، لە شارەزوور و هەورامان و هەڵەبجەو دەوروبەریان و هەموو یاخود زۆربەی هەرە زۆری بنکەو بارەگاکانمان گواستەوە بۆ (پشدەر).
دیارە لێرە دا دەبێ هەم سوپاسی (کۆماری ئیسلامیی ئێران) بکەم کە نوێنەریان هاتبوو و قسە لەگەڵ برادەرانی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان) کردبوو، برادەرانی یەکێتیش لەو مەسەلەیەدا ئیجابی هاتنە پێش، ئەوەبوو تاووتوێی مەسەلەکانمان کردو لێك گەیشتن (تفاهم)ێکمان بە یەکەوە کرد، وە سەرەنجام ئێمە بنکەو بارەگا و هێزەکانی خۆمان گواستنەوە، بۆ ئەوەی گیرۆدەی زوڵم لێکرانی زیاتر نەبین، خەڵکی دەڤەری بیتوێن و پشدەریش زۆر جوامێرانە باوەشیان بۆ گرتینەوە و بە دەنگمانەوە هاتن و تا ڕادەیەکی زۆر تاڵاوی زوڵم لێکران و کۆچ و کۆچبار و ئاوارەیی یان لە بیر بردینەوە!

6- کێشە و گرفتێکی دیکە کە بۆ (کۆمەڵی ئیسلامیی) هاتە پێش بریتی بوو لە: گیرانی وەفدی کۆمەڵی ئیسلامی کە چووبوو لەگەڵ ئەمریکییەکاندا گفتوگۆ بکات بۆ دوو مەسەلە:

یەکەم : بۆ گلەیی لێکردنیان کە بۆچی بارەگاکانی ئێمەیان بۆردومان کردوە ؟! لانی کەم بابێن خوێنمان بدەنێ و بۆمان قەرەبوو بکەنەوە و (رد الاعتبار)مان بۆ بکەن!

دووەم : بۆ ئەوە لەگەڵیان دانیشین لە نزیکەوە ئێمە بناسن کە ئێمە بەشێك بووین لە ئۆپۆزسیۆن (معارضة)ی عێراقی و زۆر دوژمنی مەبدەئی بووین بۆ ڕژێمی بەعس!

تاکو خەڵکێك کە ناحەزمانە بە هەڵە وێنامان نەکات لای ئەمریکی یەکان، بۆ ئەوە چووبووین کەچی ئەوە بوو لە ڕێ یە بۆسە و تەڵەیان بۆ دانابووین و گرتیانین، کە بەندە و سێ لە برایانی سەرکردایەتی[4] و ژمارەیەك لە برا پێشمەرگەکانمان بوون، ئەوە بوو کە برایان پێش من بەردران، بەندەش (22) مانگ لە زیندانی زاڵمانەی ئەمریکا دا مامەوە!

بەڵام دیسان (کۆمەڵی ئیسلامیی)هەڵوێستێکی عاقڵانە و لێزانانەی نواند کە ئەوە بوو لە جیاتی دەست بردن بۆ چەك کە دەمانتوانی لەوەشدا شت بکەین ، توانی بە مەنتیقێك ئەو خەڵکە بدوێنێ کە پێی ئاشنان و تێیان بگەیەنی کە ئێمە هەڵقوڵاوی نێو ئەو خەڵك و میللەتەی خۆمانین و ئێمە بەشێکین لە جەماوەری خۆمان و جیسمێکی نامۆ نین لە نێوی دا، ئەوە بوو خۆپیشاندان کرا لە هەولێر و سلێمانی بە بەشداریی خەڵکی سەرجەم ناوچەکان، وە من لێرەوە جارێکی دیکە سوپاس و مەمنوونیی

(4) کە کاك تۆفیق کەریم و مامۆستا دارا و کاك حاجی عبدالرحمن بوون .

خۆم و ئەو برایانەش کە لەگەڵم گیرا بوون بۆ هەموو لایەك و بۆجەماوەری مسوڵمانی کوردستان بە پیاوو ئافرەتەوە بە پیر و گەنجەوە بە خوێندەوار و نەخوێندەوارەوە بە ئیسلامیی و غەیرە ئیسلامییەوە دووبارە دەکەمەوە کە دیفاعیان لە مەزڵومیەتی ئێمە کرد، بێگومان ئەوان هەڵوێستێکی جوامێرانەیـان نوانـد و ئەرکێکی شـەرعییانەی سەر شـانی خۆیـان جێ بەجێ کرد بەڵام ئێمەش سـوپاسیان دەکەین و زۆریان لـێ مەمنوونین .

جا ئەوەش لە ڕاستی دا مامەڵەیەکی لێزانانە بوو لە لایەن کۆمەڵی ئیسلامیی یەوە لەگەڵ ئەو مەزڵوومییەت و کێشەو گرفتەی کە هـاتبوە ڕێگەی .

7- کێشەو گرفتێکی دیکەمان بریتی بوو لە فشار بۆ هێنانـمان لە لایـەنی برادەرانی عەلمانی یەوە! واتە پاش ئەو هەموو زوڵمانەش ئەوە بوو کە لـە لایەن برادەرانی عەلمانی حوکمڕانەوە (واتە یەکێتی) خەڵکێکی زۆرمـان لەو کاتەدا گیرا دەوری (600) کەس، وە ئێستاش بەتایبەت لە دەڤەری لای (پارتی) خەڵکمان هەر لە بەندینخانەکان دایە بـە بـێ ئـەوەی کـە تاوانیان دیار بـێ و دادگاییـەکی یاسـاییانەی خۆیشـیان بکـرێن نـەك شەرعییانەی ئێمە!

بە هەر حاڵ دیارە ئەو کاتە زۆر تەنگ بە کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵچندرابوو کە ئێمە لە زیندان دابووین، بەڵام بە ڕاستی خەڵکی نێو (کۆمەڵی ئیسلامیی) بە شێوەیەکی گشتی بە تایبەت برایانی سەرکردایەتی و مشوورخۆر، خۆڕاگر و بە شەهامەت بوون و زۆر مەبدەئی بوون و خۆیان لە ژێر ئەو هەموو زەخت و فشارانەدا گرت، ئەوە بوو کە کۆمەڵی ئیسـلامیی توانی ئەو قۆناغە و ئەو تەنگـەژەیە ببـڕێت، بە هاوکاریی هەموو لایەك وە بە هـاوکاریی ئەو خـەڵك و جـەماوەرە مسوڵمانەش، کە دەعمی ماددی و هاوکاری ماڵیان دەکردین لە کاتێکدا

برادەرانی عەلمانی لەو هەقە شەرعییەی خۆشمان بێ بەشیان دەکردین کە هەندێکیان ئێستاشی لەگەڵ دابێ بێ بەشمان دەکەن ! هەندێکیشیان (واتە یەکێتی) دیارە کەم تا کورتێك حەقە شەرعییەکەی خۆمان بە نیوە چڵــی دەدەنێ! ئەوە لە کاتێکــدا کە برادەرانی عەلمانـــی بە هەردوو حیزب و هەردوو ئیدارەکەوە ئەوە هەڵوێستیان بووە، خەڵك و جەماوەری مسوڵمانیش بە پیاو و ئافرەتەوە باوەشیان بۆ (کۆمەڵی ئیسلامیی) کردبۆوە لەگەڵیدابوون و هاوکارییان دەکرد بە لایەنی ماددی و دوعا کردن و هاندان و سەردانی کردن و پشتگیری کە بێگومان هەر شتە لە شوێنی خۆی دا جێکای خۆی گرتوە .

جا هەرچەندە ئەو کێشەو گرفتانەمان هاتوونە پێش بەڵام وەك ئاماژەم پێدا (کۆمەڵی ئیسلامیی) بەڕاستی تا ئەندازەیەکی زۆر توانی لێزانانەو شەرعییانەو وەستایانە لەگەڵ ئەو گرفت و کێشانەدا مامەڵە بکات، هەڵبەتە تا ئەندازەیەکی زۆر ئەگەرنا هەڵەو کەم و کووڕیی بە تایبەت بە لای شــلگیریی دا هەبووە، خۆ ئێمە ناڵێیــن: فریشتەی بێ هەڵەو بەفری بێ پەڵەین !

## خاڵی پێنجـەم: کۆمـەڵی ئیسـلامیـی و بەشـداریـیکردنـــی لە هـەڵبژاردن دا لە (30 / 1 / 2005) :

کۆمەڵی ئیسلامیی دوای ئەوەی کە هەڵبژاردن هاتۆتە پێش، دیارە پێش هەڵبژاردنەکە ئەوە بوو کە وەفدێکی سەرکردایەتیی[5] (کۆمەڵی ئیسلامیی) توانی لە زیندانی ئەمریکیەکاندا سەردانم بکات و کە یەکەم جار و دوا جاریشیان بوو، لە میانەی کۆمەڵێك قسەو باس دا لێیان پرسیم گوتیان: ڕات چییە ئەگەر هەڵبژاردن ببێ لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق ئێمە چی بکەین؟

(5) بریتی بوون لە : کاك حاجی قاسم و کاك عبدالستار مجید و کاك محمد حکیم .

گوتم: ئێوە خۆتان لە خەڵك دامەبڕن و لەگەڵ خەڵكی خۆتاندا بن، چونكە ئێمە لەگەڵ خەڵكی خۆمانین، ئێمە بۆ میللەتی خۆمانین و بەشێكین لە خەڵك و میللەتی خۆمان، لە هەر شتێكدا مادام لە شەرع دا جێی ببێتەوە و بەرژەوەندی خەڵكیی تێدا بێ و شتێك بێ كە جێی ڕەزامەندیی خوا بێ لەگەڵی دابن!

ئەوە بوو كە كۆمەڵی ئیسلامیی بەشداریی هەڵبژاردنی كرد، كە بەشداریی كردنەكەیشی هەڵوێستێكی لێزانانە و عاقڵانە بوو، وە بوو بە هۆی دەروو لێكرانەوەیەكی باش بۆ كۆمەڵی ئیسلامیی، وە بوو بە هۆی ئەوەی كە ئەگەر كەسانێك تا ئەو كاتەش مشتومڕیان بووبێ لەسەر ئەوە كە ئێمە ئایا ڕەسمیەتمان هەیە بوونمان شتێكی مەقبوولە یان نا؟ ئەو مشت و مڕە یەكلا بۆوە!

كۆمەڵی ئیسلامیی بوونی خۆی مسۆگەرو جێگیر(اثبات) كرد لەڕێی ئەو دەنگدان و هەڵبژاردنانەوە، خەڵك و جەماوەری مسوڵمان مەردانە هاتنە پێش و دەنگیان دایە كۆمەڵی ئیسلامیی هەرچەندە زۆرێكیش لە دەنگەكانیان تەزویرو ساختە فەوتێنران بەڵام دیسان دەنگەكان هێندە زۆر بوون كە هەر چۆن بوو كۆمەڵی ئیسلامیی توانی (6) كورسی لە پەرلەمانی كوردستان و دوو كورسیش لە كۆمەڵەی نیشتیمانی عێراق دا مسۆگەر بكات .

كە بێگومان ئەوە بوو بە هۆی زیاتر بە ڕەسمییەت ناسرنی كۆمەڵی ئیسلامیی، وە جێی خۆ كردنەوەی و قووڵ بوونەوەی و زیاتر بڵاو كردنەوەی ڕەگ و ڕیشەی بە نێو خەڵك و میللەت و جەماوەردا، وە دەمكوتكردنی كەسانێكیش كە گرەویان دەكرد لەسەر ئەوە كە ئایا (كۆمەڵی ئیسلامیی) لەگەڵ پرۆسەی سیاسی (ألعملية السياسية)دا دەبێ یان نابێ؟ چۆن نابین؟! سیاسەت بەشێكە لە دینەكەمان، وەك چۆن نوێژ دەكەین وەك دین داریی، وە وەك چۆن كاتی خۆی لە خەباتی ڕزگاریخوازی گەلەكەماندا بەشدار بووین

تفەنگمان بە ڕژێمی بەعسەوە دەنا وەك دینداریی، بە هەمان شێوەش ئێمە لە پرۆسەی سیاسیدا دەبین و بە دینداریشی دەزانین، چونکە سیاسەت ئەگەر بریتی بێ لە مشوور خواردن لە کاروباری گەل و وڵات، خۆ ئێمەش بەشێکین لەو میللەتەی خۆمان ئەگەر مشووری لـێ نەخۆین گوناهبارین ! بەڵام ئەگەر خەڵکی دیکە بە ناوی عەلمانیەت و لە ژێر بەیداغی عەلمانیەت دا مشوور لە میللـــەتی خۆی دەخـــوات! ئێمە لە ژێر بەیداغی (لا اله الا الله محمد رسول الله)دا خەمی لـێدەخۆین، ئێمە لە ژێر سایەی شەریعەتی خوادا هەوڵ دەدەین میللەتی خۆمان بەختەوەر بکەیـــن، وڵاتی خۆمان ئاوەدان بکەینـــەوە و خەڵکەکەمان ئازاد و سەرفراز بکەین .

## خاڵی شـەشـەم: کۆمـەڵی ئیسـلامیی پاش ڕزگار بوونـی بەنـدە لە زیندانی ئەمریکـــا:

دوای ئەوەی کە سوپاس بۆ خوا ئەو سێ برایانەی ئەندامی سەرکردایەتی و پێشمەرگەکانیش کە لەگەڵمدا گیرابوون پێش من ڕزگاریان بوو بوو، منیش ڕزگارم بوو لە زیندانی زاڵمانەی ئەمریکا، دوای ئەوەی کە چەند جارێك عوزریان بۆ هێنایەوە، گوتیان: بەڕاستی تۆ بە زوڵم و بە هەڵە گیراوی! وە گوتیـــان: ئەو ڕاپۆرتانەی کە لەســەر تۆ دراون بە ئێمە، درۆ و هەڵە و هەڵبەستراون، وە ئێمە بە ڕەســمی داوای لێبوردن دەکەین!!

هەرچەندە دوایین ڕۆژ کە من هاتمەوە داوام لێکردن بە نووسین بۆم بنووسن، دواییش ئەوە بوو کە قونسوڵی ئەمریکا لە کەرکوك هات لە (عەینکاوە)ی هــەولێر ئێمەی دەعوەت کرد دووبارەم کردەوە لێی و پێم گوت: ئێوە لە زینداندا هەمیشە کاربەدەستانی ئەوێتان بە ئێمەیان دەگوت: داوای لێبوردن دەکەین عوزر دێنینەوە، جا ئێستاش داوا دەکەم بۆم بنووسن، جگە لەوەش داوای قەرەبووی خوێنی شەهید و بریندارەکانی مووشەکبارانی

خورماڵ و ئەحمەد ئاواشم لێکردنەوە، بەڵام تا ئێستاش ئەو ئەمریکایەی کە لافی مافی مرۆڤ و دیموکراسیەت و چی چی لێدەدات خۆی لێ کەڕ و بێدەنگ کـــرد!

دیارە رزگار بوونی بەندە دەروویەکی زیاتری لە کۆمەڵی ئیسلامیی کردەوە، کە من جارێکی دیکە لێرە دووبارەی دەکەمـەوە زۆر سـوپاسی هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی و کادیران و ورد و درشتی نێو کۆمەڵی ئیسلامی بە پیاو و ئافرەت و پیر و گەنجەوە دەکەم، وە هەروەها زۆر سوپاسی لایەنە سـیاسی یەکان و زانایان و سەرۆك عەشـیرەتەکان نووسـەران و ئەو خەڵك ومیللەت وجەماوەرەش دەکەم کە بە ڕاستی ئەوانیش بە ڕێپێوان و ئیمزا کۆکردنەوە، بە نارەزایـی دەربڕین، بە وتار و نووسین و دوعا کردن ..... هتد هەمووی دەوری بوو لە ڕزگار کردنی بەندەدا .

جا هەرچەندە هەموو لایەك کە بەو ئەرکە هەڵساون وەك ئەرکێکـی مسـوڵمانەتی و جێ بەجێ کردنـی ئەرکـی شـەرعیانی خۆیان بەوە هەڵساون، بەڵام منیش لێیان مەمنوونم و خوای پەروەردگار پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە بە چاکترین شێوە .

## خاڵی حەوتەم: لەسـەر ڕاسـتەهـێـڵ مانەوەی کۆمـەڵی ئیسـلامیی :

مەسەلەیەکی دیکە کە دەمەوێ هەڵوەستەی لە بەردەمدا بکەم ئەوەیە کە: (کۆمەڵی ئیسلامیی) لەگەڵ ئەو هەموو گرفتانەی کە هاتنە پێشی و لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکاریانەی کە لە گۆڕەپانی کوردستان وعێراق و ناوچەکەشدا بوون، لە خوا بەزیاد بێ توانی لەسەر بنەما شەرعییەکانی خۆی بمێنێتەوە لەسەر هەڵوێست و ستراتیژیەتی خۆی بە شێوەیەکی گشتی بەردەوام بێ و بە یەکڕیزیی و تەبایی نێو خۆی و بە گونجانیش لەگەڵ لایەنە سیاسیەکاندا، درێژە بە کارو خەباتی خۆی بدات، لەگەڵ بێدادیی و ناڕەحەتیی زۆر و مەحرومیەتی و مەزڵومیەتی زۆریش دا !!

بەڵێ (کۆمەڵی ئیسلامیی) توانی هەموو ئەو تاڵاوانە قووت بداتەوە هەموو ئەو کۆسپ و لەمپەرانە ببڕێ، وە سەرەنجام ببیتە یەکێك لە هێزە جێی ئومێدەکانی نێو گۆڕەپانی کوردستان و عێراقیش، کە ئەوەش وەك ئاماژەم پێدا دەبێ سوپاسی خوای لەسەر بکەین .

وە بەڕاستی ئەگەر ئێمە ئەگەر بێر لەو هەموو هەلومەرجە سەخت و ناڕەحەتانە دەکەینەوەو دیهێنینە پێش چاوی خۆمان، بەئاشکرا دەستی خوای پەروەردگار دەبینین، بە ئاشکرا دەزانین کە بە ڕاستی خوا سەرپەرشتی ئێمەی کردوەو لەگەڵمان دا بووە و پشت و پەنامان بووە، ئومێدیشم وایە خوای بە بەزەیی هەر دەستی بە پشتمانەوە بێت و ئەو قۆناغ و لەمپەڕ و کۆسپانەش کە لە ڕێماندا ماون سەربەرزانە ببیانبڕین خوا پشتیوان بێت .

دیارە لێرەدا کە ئێمە باسی ڕابردووی خۆمان دەکەین– کە زیاتر باسی لایەنە ئیجابییەکانم کرد– بێگومان ئەوە ناگەیەنێ کە ئێمە لە هەموو شتی خۆمان ڕازین! بە ڕاستی تێبینیشمان هەبووە! لەگەڵ ئەو خاڵە ئیجابیانەش کە باسم کردن، بەڵام پێم وایە خاڵە بەهێزەکان و لایەنە چاکەکانمان لە خوا بە زیاد بێ زیاترن، وە یەکێك لە لایەنە ئیجابی یەکانمان ئەوەیە کەموکوڕی وهەڵەکانی خۆمان دەبینین و دانیشیان پێدا دەنێیـــن! چونکە وەك گوتراوە (اذا أحبّ الله عبداً بصَره بعيوب نَفْسـه)خوا ئەگەر بەندەیەکی خۆی خۆشویست ناتەواوی یەکانی خۆی پیشان دەدات، ئێمە ئەگەر ناتەواویەکانی خۆمان دەبینین و دانیشی پێدا دەنێین، ئەوەش دیسان ئیجابیەتێکی دیکەیە لە ئێمەدا، وە هەرکاتێکیش ئینسان پێی وابوو بێ عەیبە ئەو جار لە هەموو وەختان عەیبدارترە، هەرکاتێکیش ئینسان پێی وابوو چاکە ئەو کاتە لە هەموو کاتان خراپترە !

بەڵام ئێمە دەڵێین: لە قەدەر هەل و مەرجی دنیا و لە قەدەر ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرانە خوای بەخشەر ڕەحمی پێ کردووین و هەندێ چاکەمان لە دەست هاتن! بەڵام لە قەدەر ئیسلام و لە قەدەر ئەوەی کە بۆ بەرنامەی خوا

**پێویسته، بێگومان دەبێ هەر داوای لێبوردن لە خوا بکەین، لە قەدەر ئاستی بەرزی ئیسلام بەڕاستی ئێمە زۆر بچووکین، خوا پشتیوان بێ دەبێ هەوڵدەین بەرەو سەرێ بڕۆین و لە ئاستی بەرزی ئیسلام نیزیکتر بکەوینەوە !**

## تەوەرەی دووەم: سەرنجدانێکی واقیعی ئێستامان

**براو خوشکانی بەڕێز! هەر لایەنێکی سیاسیی ئیسلامیی یان غەیرە ئیسلامیی، بەڵکو هەر ئینسانێك و هەر تاكێك، ئەو واقیع و هەلومەرجە کە تێیدا دەژیەت ئەگەر نەیناسێ، ناتوانێ هەڵوێستی شایستە و پڕ بە پێستی تێدا وەربگرێت لە بەرامبەر ڕووداو و پێشهاتەکاندا کە دێتە پێشی!!**

**بۆیە دەبێ هەوڵدەین واقیعی خۆمان باش هەست پێ بکەین، هەلومەرجی خۆمان وەك کۆمەڵی ئیسلامیی، هەلومەرجی ڕەوتی ئیسلامیی لە کوردستاندا، هەلومەرجی کوردستان بە گشتی، هەلومەرجی عێراق هەلو مەرجی ناوچەکە و جیهانیش، دەبێ خوێندنەوەیەکی ڕاست و دروستمان بۆی هەبێت! مسوڵمان کاتێك دەتوانێ چ وەك تاك چ وەك کۆمەڵ هەڵوێستی پڕ بە پێست و شەرعی یانەولێزانانە وەربگرێ کە لەسەر بنچینەی شوناس و ناسین و زانینێکی باشی واقیع بنیاتی نابێت!**

**جا من ئاماژە بە چەند شتێك دەکەم کە لەم واقیع و هەل و مەرجەی ئێستاماندا هەن، چ پێشتر بوون و ئێستاش شوێنەواریان لە گۆڕەپانەکەدا مابێ، وە چ ئێستا لە ئارا دا بن .**

### یەکەم : مەسەلەی ڕەشنووسی دەستووری عێراق :

بێگومان ڕەشنووسی دەستوور (مسودة الدستور) مەسەلەیەكی گرنگ بوو، كە دیارە لیــژنە پێكهێنـــراو قسەو باسی زۆری لەسەر كرا ئەوە بوو ئەندامێكی ســەركردایەتیی ئێمــەش لە كۆتا داڕشــتــن و صیاغەكردنی ئەو ڕەشنووسەدا بەشدار بوو(6) .

سەبارەت بە دەستوور دەمەوێ ئەوە بڵێم كە: هەبوونی دەستوور لە هەر وڵاتێك و لە هەر كۆمەڵگایەكدا خاڵێكی ئیجابی و باشە، چونكە بەدیل بۆ هەبوونی دەستوور ((دەستوور كە لە هەندێك ولاتدا پێی دەگوترێ یاسای بنەڕەتی (القانون الاساسی) بریتیە: لەوهێڵە گشتییانەی كە دادەنرێن بۆ ئەوەی سیستەمی حوكمڕانی ئەو وڵاتە پێی بەڕێوە بچێت، دەسەڵاتدار چۆن بێ، میللەت چۆن بێ، دامو دەزگاكان چۆن بن، پەیوەندیان پێكەوە چۆن بێ، چۆن بە یەكەوە هەڵسوكەوت و مامەڵە بكرێ، كە بێگومان هەبوونی ئەو خاڵانە بە ڕاستی شتێكی گرنگە و زۆریش پێویستە))ئەوەیە كە دەسەڵاتدار بە ویســت و ئارەزووی خۆی قــانوون و یاســا دەربكـــات وەك لە ڕژێمــە دیكتاتۆرەكان دا هەیـــــە!

كەواتە بە شێوەیەكی مەبدەئی هەبوونی دەستوور شتێكی شەرعیی و ئیسلامییە، وە بۆ ئاگاداریشـــــتان زۆر لە زانایـــان دەڵێن یەكەمین دەستوری نووسراوە (مدوّن) لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئەو دەستوورە بوو كە پێغەمبەری كۆتایی (محمد)ی كوڕی (عبدالله)ﷺ،دوای ئەوەی كە تەشریفی برد بۆ شاری مەدینە و بناغەی دەوڵەتی ئیسلامیی دامەزراند نووسیەوە، پێغەمبەر ﷺ بە سێ شتان بناغەی دەوڵەتی ئیســــــلامیی دامەزراند، یەكەم: ئەوە بوو (وثیقة) یان (صحیفة)یەكی نووسی لە نێوان پێكهاتەكانی خەڵكی مەدینەی پایتەختی دەوڵەتی ئیســـــــلامیدا كە زۆربەیان مســـوڵمانان بوون و وێڕای

---

(6) كە پارێزەر زانا سـەعید ڕۆسـتایی بوو .

مسوڵمانان جولەکەکان هەبوون، هەروەها هاوبەش دانەر و مونافیقەکانیش هەبوون، جا پێغەمبەرﷺ چەند خاڵێکی نووسین کە دوایی ناوی لێنرا (وثيقة) یان (صحیفة) واتە (دەستووری مەدینە) کەواتە: هەبوونی دەستوور شتێکی شەرعییە، بەڵکو نەبوونی دەستوور شتێکی نا شەرعی یە چونکە بێ سەرەو بەرەیی و پاشاگەردانیی (فوضی)ی لــێ دەکەوێتەوە .

بەڵام تێبینی سەرەکی ئێمە لەسەر چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ ڕەشنووسی دەستووردا لەسەر ئاستی کوردستان، ئەوەبوو کە بە داخەوە سەرکردایەتی عەلمانی سیاسی کوردستان هاوکات لەگەڵ داکۆکی کردنی لە مافە نەتەوایەتییەکانی گەلەکەمان کە ئەوە خاڵێکی هاوبەش بوو لە نێوانماندا،کاتێکی زۆر وهەوڵدانێکی زۆریشیان تەرخان کرد بۆ داکۆکی کردن لەسەر بە عەلمانی کردنی دەستوور!! کە بە ڕاستی ئەوە خاڵێکی خراپ بوو، وە بۆ ئێمەی ئیسلامییش خاڵێکی جیاواز بوو لەگەڵ برادەرانی عەلمانی دا، چونکە ئێمە لەسەر ئەوە یەك دەنگین کە میللەتی کورد و خەڵکی کوردستان بە هەموو پێکهاتەکانیەوە پێویستە حەق و مافەکانی هەبن و ئەو ڕژێمە دیکتاتۆرە یەك لە دوای یەکانە کە لە بەغدا حاکم بوون و زوڵمیان لەو میللەتە کردوە کە بە هاووڵاتی پلە دوو و سێ یان تەماشا کردوە، هەموومان لەسەر ئەوە یەك دەنگین و ئێمە دەڵێین : کورد و هەر نەتەوەیەکی دیکە هەقی خۆیەتی کە ڕزگار و ئازاد و سەربەست بێت و خاوەنی کیان و ئیدارەو ئیرادەی خۆی بێت بگرە لە ڕاستی دا لە ئیسلام دا هیچ پەرچ و مانیعێك نیە کە کوردیش خاوەنی دەوڵەت بێ وەك چۆن خەڵی دیکەش خاوەن دەوڵەتە، بەڵام بێگومان داکۆکی کردنی سەرکردایەتی کورد برادەرانی عەلمانی لەسەر بە عەلمانی کردنی دەستوور خاڵێکی زۆر بێجێ بوو ، وە بە زیان و زەرەریش تەواو بوو بۆ سەر گەلی کورد لە دوو ڕووەوە:

یەکەم: لەوەدا کە خەڵك بیانووی دەست دەکەوێ بڵێ: سەرکردایەتی سیاسی کورد ئەوەتا عەلمانیەت پیادە (تبنّي) دەکات و بە دەوڵەتی ئیسلامیی ڕازی نیە، بەوە ڕازی نیە کە شـەریعەتی ئیسلامیی سـەرچاوەی هەموو یاساو دەسـتوورەکان بێت!! دیـارە ئەوەش خاڵێکـی خراپـــە بۆ میللەتەکەمـــان و ناوی میللەتی کوردی پێ بەد دەبێ، دوژمن و ناحەزانمان بیانوویان دەکەوێتە دەست بۆ ئەوەی ناشیرینمان بکەن !

دووەم: ئەو جوهـــدو توانایـــەی ســـەرف کرا لە پێناو بە عەلمانی کردنی دەستووردا، ئەو کات و وەختەی بۆ ئەو مەبەستە تەرخان دەکرا، دەبوایە دابین کرابایە بۆ زیاتر دابین کردنی مافە هەمەجۆرەکانی میللەتەکەمان! کە من پێم وایە ئەو هەموو داکۆکی کردنە لەسەر بە عەلمانی کردنی دەستوور زیانی زۆری دا لەو بارەوە .

بەڵێ ئێمە ئەو تێبینی یەمان هەبوو لەسەر مەسەلەی ڕەشنووسی دەســتووری عێراق، بەڵام هەرچۆنێـك بێت ئێمە لە ڕاپرســـییەکەدا (بەڵێ)مان کرد بۆ دەستوور، بۆچـــــی؟ چونکە لە ڕاستی دا پێگەی ئیسلام لە دەستووری عێراقدا پێگەیەکی مەحکەم و بەهێزە، بۆ وێنە:-

یەکەم : لەوێ دا هاتوە کە دینی ڕەســمی دەوڵەتی عێراق ئیســلامە (دین)یش واتە بەرنامەی ژیان! لە ڕاستیدا زۆر کەس وشەی دین هەر بە مەفهوومە نەصرانیەکەی تەماشا دەکات کە بریتییە لە پەیوەندی نێوان ئینسان و خوا (جل شأنه) و لایەنی ڕووحی و چەند وردە درووشمێك، بەڵام دین لە ئیسلامدا واتە بەرنامەی ژیان (ان الدين عند الله الاسلام) (ال عمران -19) کە دینی ڕەسمی دەوڵەت ئیسلام بێ واتە بەرنامەو ڕێبازی ڕەسمی لە عێراقدا بریتییە لە ئیسلام!

دووەم : تێیدا هاتوە کە نابێ هیچ یاســـاو قانوونێـــك دەربکرێ کە پێچەوانەی شەریعەت بێ،کە دیارە ئەوەش شتێکی زۆر چاکە، بەڵێ دوایی خاڵێکی تێدایە کە بەڕاستی جۆرێك لە دوو فلیقانەیی (ازدواجیة) دروست دەکات، دەڵێ: نابێ هیچ یاسایەك دەربچێت پێچەوانەی بنەماکانی دیموکراسی بێ!

بەڵام ئێمە دەڵێین: دەبێ لێرەدا مەبەست لە بنەماکانی دیموکراسی ئەو بنەمایانە بن کە لەگەڵ شەریعەتی خوا دژایەتی یان نەبێ، لەگەڵ ئەو دینە ڕەسمییەی کە لەعێراق دا (تبنّي)کراوە دژایەتیی وناکۆکییان نەبێ و هـــەر بنەمایەکی دیموکراســـی لەگەڵ دینی ڕەســـمی دەوڵەت لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا دژایەتی هەبێ ڕەتکراوە (مرفوض)یە .

ئەوە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەش بەڕاستی دەســتووری عێراق زۆر شتی باشی تێدایە، ئەگەر پیادە بکرێ، بۆ نموونە: دەبێ ئەو هەموو خەڵکە بە ناهەق و بە زوڵم گیراوانەی ئێمە کە ئێستا لەزیندانەکان هەردوو ئیدارەکانی هەولێرو سلێمانیدا ماونەتەوە کۆتایی پێ بهێنرێ و بەربدرێن، هەروەها دەبێ چەندان بێ سەرەو بەرەیی و نادادگەریی و زوڵم و ستەم کە لە خەڵك دەکرێ و، ئازادیی کە لە خەڵك دەگیرێتەوە، دەبێ هەموو ئەو شتانە کۆتایی یان پێ بێت.

بەڵێ ئەگەر ئەوەی کە لە دەستوور دا هاتوە وەك: ئازادیی شەخسی و دادگەریی کۆمەڵایەتی و دابەشکردنی داهات بە دادگەریی و ڕەخساندنی هەلو مەرجی ژیانی دادگەرانە بۆ هەموو لایەك بە یەکسانی و نەهێشــتنەوەی هیچ گیراوێك لە بەندینخانـــەدا بەبێ دادگایـــیکردن تۆمەتبار نەکـران بە بێ بەڵگەو .... هتد، ئەگەر ئەوە هەمووی جێبەجێ بکرێ، ئەوە بێگومان ئێمە زۆر خـــەم و کێشـــەو گرفتمان لە کۆڵ دەبنەوە کە ئێستا لەگەڵیاندا دەستەو یەخەین!

ئنجا له ڕووی نەتەوەییشەوە هەرچەندە تێبینیمان لە سەر ئەو دەستوورە هەیە، بەڵام دیسان شی باشیشی تێدایە، بۆیە ئێمە (بەڵێ)مان بۆ کرد، ئنجا ڕەنگە هەندێك کەس تێبینی‌یان بووبێ کە لەو دەستوورەدا هەندێك شتی نا شەرعیی تێدایە، بەڵێ دەزانین! هەندێك شتی تێدایە کە ناشەرعییە بەڵام لە ڕاستی دا لایەنە شەرعییەکانی زیاترن، وە ئەگەر لایەنە شەرعییەکان چاك پیادە بکرێن ئەو لایەنە نا شەرعییانە مەفعولیان نامێنێ، وە لەو قۆناغەشدا دیـــــــارە هەر ئەوەندە دەکرێت، بۆیە ئێمە بەڵێ مان بۆ کردوە بەڵێ بۆ کردنەکەشمان بە شتێکی شەرعیی و ڕەوا زانی .

وە من بە پێویستیشی دەزانم کە لەمەو لا نووسەرانی ئێمە، ڕاگەیاندنی ئێمە ،مامۆستایانی ئێمە، ئەو لایەنە ئیسلامییەی دەستوور زۆر بدرەوشێننەوە، برادەرانی عەلمانـــی لەگەڵ ئەوەشدا کە لایەنە عەلمانیەکەی دەستوور زۆریش لاوازە بەڵام زۆریان بەرجەستە کرد و پێیان هەڵاگوت !

کەچـــی ئێمە وەك ئیســـلامیی جێی داخە نەمانتوانیــــــوە کە لایەنە ئیسلامییەکەی باش بەرجەستە بکەین و بیدرەوشێنینەوەو دەری بخەین، کە بێگومان ئەوە ئەرکی ئەم قۆناغەمانە .

## دووەم : مەســەلەی ڕەشــنووســی دەســتووری کوردســتان :

برادەرانـــی یەکێتی وپارتی ڕەشنووسێکی دەستووری هەرێمی کوردستانیان پێشنیار کرد، ئەوە بوو نوسخەیان دایە لایەنەکان، ئێمەش وەك کۆمەڵی ئیســلامیی کە برایانی یەکگرتووی ئیسلامیی لەوەدا لەگەڵمان هاوڕا بوون، دوای تەماشا کردنی ئەو ڕەشــنووســە، تێبینی ئێمە لەسەری ئەوە بوو کە لەو ڕەشــنووســەی هەرێمی کوردستاندا نەهاتوە کە دینی ڕەسمی لە هەرێمی کوردستاندا چیە؟!

باسی ئیسلام نەکراوە و ناوی خوای تێدا نەهێنراوە و(بسم الله)ی تێدا نەکراوە، وە باسی ئەوەش نەکراوە کە نابێ هیچ یاسایەك دەربچێ کە پێچەوانەی شەریعەت بێ!!

لەبەر ئەوە ئێمە بە ڕەسمی ڕەخنەو ناڕەزاییمان پێشکەشی پەرلەمان کرد بە ناوی (کۆمەڵی ئیسلامیی)و(یەکگرتووی ئیسلامیی)یەوە کە ئەگەر بەلای کەمەوە ئەوەی لە دەستووری عێراق دا هاتوە لە ڕەشنووسی کوردستاندا نەنووسرێ و نەچەسپێنرێ ئەوە ئێمە لەگەڵ ئەو دەســـتوورە نین، وە ناڕەزایی بەرانبەر دەردەبــڕین وە لە ڕاپرسییەکەشیدا یان بەشداری ناکەین، یان لە دژی دەنگ دەدەین بەڵکو ئێمە هەر هۆکارێك کە لە دەستمان بێ و بە گونجاوی بزانین و لە شـــەرعدا جێی ببێتەوە دەیگرینـــە بەر بۆ دژایەتی کردنی ئەو ڕەشنووسی دەستوورە کە هیچ حیسابێك ناکات بۆ دینی ئەم وڵاتە، بۆ تایبەتمەندیی یەکانی خەڵکی مسوڵمانی کوردستان کە هەموو لایەکیش لەسەر ئەوە یەك دەنگیــن وە دەڵێیــن بە ڕێژەی (95٪)ی خەڵکی کوردستان و عێـــراق مسوڵمانـــن ! ئەدی چـــۆن نابێ باسی دین و شـــــەریعەتەکەیـــان بکرێت ؟!

## ســێ یەم : داگیــر کرانی عێراق لە لایەن ئەمریکاوە :

هەموو لایەك ئاگادارین کە ئەمریکا شەری لەگەڵ ڕژێمی پێشووی عێراق کردو هات ڕژێمی بەعسی ڕووخاند، دیارە ئەمریکا خۆی ناو نا (داگیرکەر)، وە لە نەتەوە یەکگرتووەکانیش بە ڕەسمی ئەمریکا بە داگیرکەر (محتّل) لە قەڵەم دراوە، کەواتە بەڵگە نەویستە کە ئێستا ئەمریکا وڵاتێکی داگیرکەرەو

**له عێراقدا ماوە! خەڵكێكیش هەیە كە بەرهەڵستی و بەرەنگاری ئەمریكا دەكات !**

**جـا ئێمە ئەو مەســـەلەی هەبوون و مانەوەی ئەمریكا لە عێراقدا و بەرهەڵستی كرانی بەكورتی ئاوا هەڵدەسەنگێنین :**

**له ئەسڵ دا كاتێك دەوڵەتێك شوێنێك، سەرزەمینی میللەتێك، وڵاتێك داگیر دەكات، بەڕاستی دیارە بۆخۆی داریان دەداتە دەست و دەڵێ: دژم بوەستن! وەك پرسیارێك لەو بارەوە لە جۆرج بۆش كرابوو كە ئەگەر كەسێك وڵاتەكـەی**

**تۆ داگیر بكات چی دەكەیت؟ گوتبووی: بەرهەڵستی و بەرگری دەكەم! لەبەر ئەوە لە ئەسڵدا بەرهەڵستی (مقاومة) كردنی هێزێك كە دێت وڵاتێك داگیر دەكات شتێكی ڕەوایە، هەم (شرائع)ی ئاسمانی هەم (قوانین)ی زەمینی هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە ئەگەر هات و كەسێك ماڵی كەسێكی داگیر كرد دەبێ دەربكرێ و بەرپەرچی بدرێتەوە، وە شەرعزانەكان (الفقهاء) لەژێر ناونیشانی (دفع الصائل)دا ئەوەیان باس كردوە، هەروەها هەر كاتێك دەوڵەتێك دەستدرێژی بكاتە سەر وڵاتێكی دیكە پێویستە دەستدرێژیەكەی بەرپەرچ بدرێتەوە .**

**بەڵام ئێمە ئاوا تەماشای ڕەوتی بەرهەڵستكاری (مقاومة) ناكەین بە گشتی! ئەو بەرهەڵستكارییەی ئێستا هەیە لە عێراقدادەبێ پۆلێن (تصنیف)ی بكەین، كە بێگومان ئەو بەرهەڵستییە بەشێكی دەگەڕێتەوە بۆ كۆنە بەعسی یەكان وە بۆ خەڵكێكی عەرەبی شۆڤێنی كە پێیان وایە ئەو هەل و فرسەتەی كە پێشتر هەیانبوو – كە بۆخۆیان یەكە كوێخای عێراق بوون – لە دەستیان چووەو ئەوانە بۆ بەختی دۆڕاوی خۆیان دەگرین! هەروەها دەستی دەزگا**

هەواڵگری‌یەكانی هەندێك لە دەوڵەتانیشی تێدایە كە لەسەر خاكی عێراق لە دژی ئەمریكا دەجەنگن !

وە دەستی هەندێك باندی مافیاو قاچاغچیشی تێدایە كە مەبەستیان پارە پەیدا كردن وخەڵك ڕووتاندنەوەیە، بەڵام بەڵگە نەویستە كە خەڵكێكی ئیسلامیشی تێدایە كە بە پاڵنەر(دافع)ێكی ئیسلامیی لە دژی ئەمریكا دەجەنگێ ! جا لەئەنجام دان و مومارەسەكردنی موقاوەمەكەیدا چەندە شەرع دەپێكێ و پابەندە پێیەوەو چەندەش لە شەرع دەچێتە دەرو لادەدات، ئەوە شتێكی دیكەیە !!

## چــوارەم: چارەســەری كێشــەو ئـاڵۆزی یەكـانی نێوخــۆی عێراق :

ئێمە پێمان وایە چارەسەری كێشەی ئاڵۆزكاوی عێراق بەگشتی و، لایەنە سیاسیەكان بەتایبەتی ئەوەیە كە هەموویان پێكەوە (تفاهم) بكەن و لە یەكتر تێبگەن، كە ئێستا سێ بەشی سەرەكین: شیعە، كورد، ئەوەی ناوی لێنراوە عەرەبی سوننە، پاشان ئەوانە دوای ئەوەی كە ڕێككەوتن و گەیشتنە ئەنجامێك بەڕەسمی ئەمریكا ئاگادار بكەنەوە كە تۆ بڕۆ ڕژێمی بەعست ڕووخاند سوپاست دەكەین، هەرچەندە بەرژەوەندیی خۆشتی تێدا بووە بەڵام بە هەرحاڵ بۆ ئێمە بە خێر گەڕا، ئێستاش بڕۆ بۆ ئەوەی هەم سەربازەكانی تۆش زیاتر نەكوژرێن و هەم چی تر وڵاتەكەی ئێمەش كاول نەكرێ! وە خەڵكێكیش كە لێرە لەسەر ســەر زەمینی عێراق (تصفیە)ی حیساب لەگەڵ تۆ دەكات بیانوویان نەمێنێ! بۆ خۆشت و بۆ ئێمە وا باشترە ، ئەوە هەڵوێستی ئێمەیە لەو بارەوە .

## پێنجــەم : كێشــە و ئـاژاوەی نێوان شــیعــە و ســوننە :

ئەو شەڕ و کێشەیەی کە لە نێوانی هەندێك لە شیعە و هەندێك لە خەڵکی سوننەدا هەیە ئێمە بەم شێوەیە تەماشای دەکەین :

دەڵێین بە ڕاستی هەڵە لە هەردوو لاوە هەیە بە پێی تێخوێندنەوەی ئێمە و شارەزایی و زانیارییەکانی ئێمە، خەڵکێك لە سوننە دەکوژرێ و خەڵکێکیش لە شیعە، بەڵام پێمان وایە ئەگەر سەرنجی هەردوولا بدەین لە سەرەتاوە زیاتر بار بەلای (زەرقاوی)و گروپەکەی دا دەکەوێت دواییش زیاتر بەلای شیعە توند ڕەوەکاندا، ئەو فەتوایەش کە(زەرقاویی) دەری کرد ئەوە بوو زانایانی ئیسلام هەموویان ڕەخنەیان لێگرت وقسەکەی قسەیەکی ناشەرعی و هەڵە بوو، هەم پێچەوانەی شەرع و هەم پێچەوانەی عەقڵو سیاسەتیش بوو، کە خەڵکی هاندا لەسەر کوشتنی شیعەکان بە بەبێ جیاوازی، کە بێگومان ئەوە شتێکی زۆر نابەجێیە، چونکە ئەهلی سوننە وجەماعە کە زۆرینە (جمهرة)ی مسوڵمانانن بە درێژایی مێژوو هەمیشە هەڵوێستیان لەگەڵ نەیارانیان‌دا کە ناویان ناون (اهل البدع) بە هەموو جۆر و شێوەکانیانەوە هاوسەنگ و دووربینانەوە نەرم بووە، بەڵام هەڵوێستی خەڵکی دیکە بەرانبەر ئەهلی سوننەو جەماعە توند بووە!

ئەوەتا (علی بن ابی طالب) خوا لێی ڕازی بێ، خەواریج بە کافریان دادەنا بەڵام کاتێك پرسیاری لێ دەکەن دەربارەی خەواریج دەفەرموێ: (اخواننا بَغَوا علینا) برامانن بەڵام زوڵمان لێ دەکەن !

پێیان گوت: ئەدی کافر نین؟ فەرموی: نەخێر (من الکفر فرّوا) ئەوان لە کوفر ڕایان کردوە! گوتیان: ئەدی منافیق نین؟ فەرمووی: نەخێر خوای پەروەردگـــار دەربارەی مونافیقەکان فەرموویەتی ﴿ لا یذکرون الله الا قلیـلا ﴾ (النساء 142).

واتە: تەنیا بە کەمی یادی خوا دەکەن، بەڵام ئەوانە نوێژ دەکەن وقورئان دەخوێنن وعیبادەتی زۆریشیان هەیە، بەڵام هەرچۆنێك بێ برامانن و لەسەر ناهەقن !!

ئەوە هەڵوێستی خەلیفەکانی پێغەمبەر ﷺ و ئەهلی سوننەو جەماعەیە کە بە دوای هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ کەوتوون! کەواتە بە ڕاستی بە کافر دانانی شیعەکان و بە ڕەوا زانینی کوشتنیان شتێکە پێچەوانەی ئیمان و عەقیدەو پێچەوانەی بۆچوون و ڕێڕەوی زانایانی ئەهلی سوونەو جەماعەیە، بەڵام بێگومان کەسانێکیش هەن لە نێو شیعەدا کە هەڵەو پەڵەی زۆریان هەیە، ڕۆژانە دەبیستین کە ڕەمزێك یاخود وتاربێژێك و بانگخوازێکی سوننە دەکوژرێ! هەر ڕۆژە چەندین تەرمی خەڵکی سوننە دەدۆزرێتەوە(1)، کە بێگومان ئەوەش دەستی ئەوانیشی تێدایەو ڕەنگە دەستی خەڵکی دیکەی سێیەمیشی تێدا بێ! بە تایبەتیش کە باسی شەڕی ڕەگەزی و تائیفی دەکرێ خەڵکی دیکەی خاوەن غەرەزی خراپیش دەتوانێ لەو نێوانە دەوری خۆی ببینێ، وەك گوتراوە ڕاوکەری خراپ لە ئاوی قوڕاودا ڕاوی دەکات!

## شــەشــەم : واقیعـــی کوردستان

من تێڕوانینم بۆ واقیعی کوردستان لەم چەند خاڵانەدا دەخەمە ڕوو :

1- خوای دادگەر دەفەرموێ ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا﴾(الانعام -152) ئەگەر قسەتان کرد دادگەربن، خەڵکێکی ئێمەی ئیسلامیی هەیە کە تەماشای برادەرانی (یەکێتی و پارتی) دەکات کە ئەمڕۆ دوو ئیدارەیان پێك هێناون – هەرچەندە ئەوان ناویان لێناوە حکوومەت بەڵام لە ڕاستی دوو ئیدارەی حیزبین کوردستان بەڕێوە دەبەن- کە تەماشای ئەوان دەکات هەموو شتێکیان بە خراپ دەبینێ و نیشانەی چەوت (×)یش بەسەر هەموو شتێکیان دادێنێ! بەڵام لە ڕاستی دا ئەوە بێ ئینسافییە، چونکە خوای کاربەجێ دەفەرموێ ﴿ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا ﴾ (المائدة -8) با ڕق هەستانتان لە کەسانێك – کە

---

(1) دیارە ئێستا کوژرانی خەڵکی سونی بە دەست سوپای ڕەسمی و میلیشایی نارەسمی شیعە زۆر زیادی کردوە.

ڕقتان لە هەلسوکەوت و کەموکووڕی و هەڵەکانیان هەڵدەستێ – واتان لێ نەکات کە دان بە چاکەکانیشیان دانەهێنن و نادادگەر بن !

بێگومان دەبێ ئێمـــە بزانین برا و خوشـــکانی بەڕێز! ئەم واقیعەی ئێستای کوردستان کە برادەرانی (یەکێتی و پارتی) تیایدا حوکمڕان و حوکم بەدەستن، ئەوە بەرهەمی کرد و کۆششی ڕابردوویانە لەو پێناوەدا قوربانی یان داوە! بەڵێ ئێمە تێبینیمان هەیە لەسەر ئەو ڕێبازانەی گرتوویانەتە بەر هەر لە سۆشیال دیموکرات و مارکسیزم و لینینیزمەوە بگرە هەتا, دیموکراسی، لیبڕالیزم، عەلمانیەت ..... هتد، بەڵـێ تێبینیمان زۆرە، بەڵام نکووڵی لەوە ناکرێ کە خۆیان ماندوو کردوە و هەوڵیان داوە و خەبات و بەرخۆدانی زۆریان کردوەو، شەونخوونی زۆریان کێشاوە و خەڵکیان کوشتوە خەڵکیان بە کوشت داوە، تا لە ئەنجامدا بنکەو پێگەیەکی جەماوەرییان بۆ خۆیان دروست کردوە !

ئەوە ڕاستی یەکە دەبێ بزانرێ بۆ ئەوەی هەم تووشی بێ ئینسافی نەبین، وە هەم تووشی ئەوەش نەبین کە پرسیارێکمان ڕووبەڕوو ببێتەوە نەزانین وەڵامی بدەینەوە! ئەویش ئەوەیە کە: باشە مادام ئێمە و ئەو خەڵك و جەماوەرەش مسوڵمانین ئەدی بۆچ برادەرانی (یەکێتی و پارتی) کە هەردووکیشیان عەلمانیەتیان پیادە کردوە، کەچی ئەوان لە قۆناغەدا حوکمڕان و باڵادەستــن ؟! وەڵامەکەی ئەوەیە چونکە ئەوان ماندووبوون و قوربـــانی زۆریـــان داوە وە لە پێش ئێمــەدا خەباتی شــار و شـــــاخیان دەســت داوەتێ وخــواش فەرمووەیـــــەتی: ﴿ وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنسَـــانِ إِلاَّ مَا سَعَى﴾ (النجم –39) بەڵام ئەم تێبینی یانەشمان لەسەریان هەیە :

2- هەردووك ئیدارەکە ئیدارەی حیزبین، دیارە ئێمە بە گشتی قسە دەکەین، بە بەڵگەی ئەوەی کە بەرپرسەکان زیاتر لە خۆیانن یاخود ئەوەی کە لە

خۆشیان نەبێ لە بن دەستی خۆیاندایە و بە ئاراستەی خۆیان بەڕێوە دەچێ! واتە برادەرانی (یەکێتی و پارتی)،کە ئەوەش بەڕاستی خاڵێکی لاوازە چونکە حکومەت کردن لە حیزبایەتی جیایە! حکومەت دەبێ بۆ هەموو میللەت بێ بەبێ جیاوازی، بەڵام حیزبایەتی تەنیا بۆ حیزبەکەی خۆشت بێ لێت بە عەیب ناگیرێ، بەڵام کە گوتت حکوومەتم دەبێ بۆ هەموو خەڵك بی، وەکو کورد دەڵێن: حکومەت بابی میللەتــــە، دەبێ باب بە یەك چاو سەیری خێزانەکەی ومنداڵەکان بکات، نەك هەندێکیان بە ڕەســەن و ئــەوانی دیکە بە زڕ دابنــێ! دەبێ بە یەك چاو ســـەیری هەموویان بکات و لە نێوانیشیاندا دادگەر بێت .

بەڕاستی ئەوە خاڵێکی زۆر لاوازە کە تا ئێستاش ئەو دوو ئیدارەیە نەیانتوانیوە خۆیان لە قاوغی حیزبایەتی بەرنە دەر، دوو ئیدارەی حیزبین! دیسان ئەوەش لێرەدا ئەوە ناگەیەنێ کە هیچ شتێکی چاکیان نیە ! بە تەئکید گەلێك خزمەتگوزاری و پڕۆژەی باشیان پێشکەش کردوە، بەڵام لە قەپێلك و چوارچێوەی حیزب نەچوونەتە دەر، کە هەر ئەوەشە ڕێگای گرتوە لە یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارە کە خاڵێکی لاواز و سلبی یە بەسەر هەموو میللەتەکەمان دا دەشکێتەوە!

بیستم کە جارێك بەرپرسێکی ئەمریکی بە برادەرانی (یەکێتی و پارتی)ی گوتبوو: باشــــە ئێوە داوای کەرکــووك دەکەن، گریمان ئەوە کەرکووکمان پێدان بەڵام بیلکێنین بە کام لە دوو ئیدارەکانتانەوە بە سلێمانی یەوە یان بە هەولێرەوە ؟!

3- هەوڵدانی برادەرانی (یەکێتی و پارتی)بۆ سەپاندنی عەلمانیەت بە فیکر و سیاسەتییەوە بە ڕاگەیاندنیەوە بە لایەنی ئەخلاقییەوە بەلایەنی کلتووری بەلایەنی هەڵسوکەوت و ئادابی کۆمەڵایەتییەوە ...... هتد .

كە بێگومان ئەو ڕەفتارەشیان خاڵێكی زۆر لاوازە، چونكە دەبینین لە شوێنانی دیكە خەڵك خۆشی بە عەلمانی ناو دەبات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە توندی دژایەتی دین ناكات وەك بڵێی: عەلمانیەكی هاوسەنگ و واقع بینە! بەڵام بە ڕاستی ئەو برادەرانەی لای ئێمە زۆر جار عەلمانیەتێكی توند ڕەو (متطرف) پیادە دەكەن، زۆر جار هەندێكیان بوونی لایەنێكی ئیسلامیی بەڕەسمی دەخەنە ژێر پرسیارەوە و لە ڕاگەیاندنەكانیان دا باس دەكەن كە مادام مسوڵمانین بۆچی دەبێ لایەنێكی ئیسلامیی هەبێ؟! ئێ كاكە ڕاستە هەموومان مسوڵمانین بەڵام خۆ هەمووشمان كوردین بۆچی دەبێ لایەنێكی كوردی نەتەوەیی هەبێ ؟! هەموومان مسوڵمانین بەڵێ! بەڵام بۆچی مامۆستایەكمان هەیە كە لە میحرابدا پێش نوێژی مان بۆ دەكات، هەمووشمان مسوڵمانین بەڵام دەبێ یەكێكمان لە پێشەوە بێ؟! دەجا وەك چۆن بۆ بەجێهێنانی نوێژ پێشەوایەكمان پێویستە و پەكمان لەسەر ڕیزبوون ورێك وپێكی (النظام) كەوتوە، بۆ ئەنجامدانی ئەركەكانی دیكەی ئیسلامیش بە هەمان شێوە .

ئینجـــــــا بە عەلمانیكردنی میللـــــەت و كۆمەڵگاش هەم لە ڕووی نەتەوەییەوە خراپە، هەم لەڕووی سیاسی یەوە، وەهەم لە ڕووی تەبایی نێو خۆشمانەوە، چونكە دینداریی و مسوڵمانەتی بەڕاستی هەوێنە! زۆر كەس وادەزانێ ئێستا لە ئەورووپا و ڕۆژئاوا دین هیچ كاریگەرییەكی نیە، نەخێر بەو شێوەیە نیە، ئەوەتا لە هەڵبژاردنی ئەم دواییەی ئەڵمانیادا حیزبێكی دینی حیزبێكی نەصرانی حوكمی بەدەستەوە گرت! یاخود دەڵێن: جۆرج بۆش سەرۆكی ئەمریكا هەموو یەكشەممەیەك دەچێ بۆ كەنیسە، وانیە كە خەڵك یەكجاری پشتی لە دین و خوا كردبێ! بە هەڵە یان بە ڕاست لە ڕۆژئاوا جۆرێك لە دینداریی وعیبادەتی شەخصی هەیە .

ئنجا بەڕاستی ئەوەی کەبرادەرانی عەلمانیی کوردستان دەســـتیان داوەتێ و دەیانەوێ بیکەن هەر ئەو ئەزموونە فاشـــیلەیە کە کاتی خۆی (کەمال ئەتاتۆرك) لە تورکیا کردی! بەو کارەشـــــی تورکیای زۆر بە دواخست، تورکیا کە سەرقافڵەی میللەتان و وڵاتان بوو دوایی بوو بە پاشکۆ، بەڵام ئێستا وردە وردە خەریکە خەڵکەکە دەگەڕێتەوە و واز لەو کەمالیــزمە دێنێ، ئەو عەلمانیەتـــە توند ڕەوەی کە (کەمال ئەتــاتورك) ویستی بیسەپێنێ، کەواتە بۆچی ئێمە ئەزموونی هەڵەی خەڵکی دیکە دووبارە بکەینەوە ؟!

ئنجا بێگومان ئەگەر لە نێو میللەتەکەماندا دین و مسوڵمانەتی هەبێ، لە خوا ترسان و پابەندی بە شەرعەوە هەبێ، تێبینی کردن و ڕەچاو کردنی حەڵاڵ و حەرام هەبێ،بە تەئکید تەبایی و برایەتی و پاکی و سەلامەتی زیاتر دەبێ، ئێستا لە نێو میللەتەکەماندا هەموو ڕۆژێك باسی ڕوودانی چەندین دیاردەی دزێوی وەك دزیو فەسادی ئەخلاقـــی و چی و چی دەکرێ، ئەوە هەمووی شوێنەواری بانگەشەی عەلمانیەت و بێ دینایەتی و قسە گوتن دژی خواو پێغەمبەر ﷺ و کاڵ کردنەوەی لایەنی دینداری و ڕووحی و عیبادەتە لای خەڵك !!

لە ئەنجامی عەلمانیەت و دوورکەوتنەوە لە دینداریی و مسوڵمانەتیدا کۆمەڵێك کێشەو گیــروگرفتی کۆمەڵایەتـــی و ئەخلاقیمـــــان ڕووبەڕوو بوونەتەوە کە ئێستا نازانین چۆنیان چارەسەر بکەین! وەك ئەورووپا کە وەنەبێ لەو بارەوە وەزعی باش بێت، بەڵکو ئەوانیش گیریان خواردوە بەدەست کۆمەڵێك گیــروگرفتی ئەخـــلاقی و خێزانی و کۆمەڵایەتـــیەوە نازانن چۆنیان چارەسەر بکەن !

4- تێبینیەکی دیکەمان ئەوەیە کە بەڕاستی لە ڕووی نەتەوەیی یەوە، وە لە ڕووی ئیداریی و لە ڕووی دادگەری کۆمەڵایەتی و لە ڕووی ئازادیی یەوە ئەو دوو ئیدارەیە زۆر لە پاشن !

لە ڕووی نەتەوایەتی یەوە تا ئێستاش نەیانتوانیوە هەردوو ئیدارەکــە یەك بخەنەوە، ئیستاش خەڵك(7) لە هەولێر زیاتر هەســت بە (پارتی) یایەتی خۆی دەکات، وە لە (سلێمانی)ش خەڵك(8) زیاتر هەســـــت بە (یەکێتــــــی) یایەتی خۆی دەکات! باشە مادام لە هەردوولا بانگەشەی کوردایەتی دەکرێ با وابێ خەڵك هەست بە کوردایەتیی خۆی بکات لە دوای مسوڵمانەتی! وە لە ڕووی ئیدارییەوە ئەوە واقیعە کە لەبەرچاوە وشەی (گەندەڵیی ئیداری) وشەیەکی زۆر لەسەر زاران باوە، وە لە ڕووی دادگەریی کۆمەڵایەتیشەوە دەبینین کە هەرچی ئیمتیازاتی حکومی یە بۆ ئەندامانی هەردووك حیزبی دەسەڵاتدار قۆرخ کراوە، هەر لە زەوی دابەش کردنەوە بگرە تاکو دامەزراندن و هەرچی سوودمەند بوونی دیکەیە! بۆیە خەڵك و جەماوەری کورد ناڕازی و بێزارە، بەڵام زۆر جار دەستی ئەوەی شکاوە دەڵێن، نەبادا شتێك بکەین بۆ لایەنی نەتەوەییمان زیانی هەبێت، من پێم وایە دوای ئەوەی کە کێشەی نەتەوایەتیمان چارەسەر دەبێ - خوا یار بێ دان بە فیدراڵیەت دادەنرێت و بە تەواوی دەچەسپێ - بە ڕاستی ئەو خەڵکە ئاوا بێ دەنگ نابێ!! وە ئێمەش وەك لایەنێکی ئیسلامیی نابێ لەو قڕی و پڕی یە ڕابمێنین، نابێ لەو زوڵم و نادادگەری و گەندەڵیی ئیدارییە بێ دەنگ بین!

چونکە ئێمە نابێ تەنها ئەوە بە ناشەرعیی بزانین کە ئافرەتێك سەرپۆشی لەسەر نەبێ، یاخود گەنجێك لە ڕەمەزاندا بە ئاشکرا جگەرە

---

(7) واتە خەڵکی نێو پارتی .
(8) واتە خەڵکی نێو یەکێتی .

بكێشیێ! بەڵێ ئەوە ناشەرعی یەو بێ ڕێزییە بەرانبەر بە هەستی مسوڵمانان، بەڵام بەڕاستی ئەوەش زۆر ناشەرعییە کە زەوی دابەش دەکرێو خەڵکێکی شایستە (مستحق)یشی لــێ بێ بەش دەکرێ! دەشبینین کە بە تەزکیەی حیزبی کابرا سێ چوار پارچە زەوی وەردەگرێ، لەگەڵ ئەوەشدا لە کۆشك و تەلارێکی گەورەدا دەژی، بەڵام ئەوی دیکە (کۆڵیت)ێك نیە تێیدا بحەوێتەوە! یان بۆ وێنە: هەمووومان پێکەوە پێشمەرگە بووین لە خەباتی شاخدا بەشدار بووین،بەڵام پێشمەرگەی ئەوان هەموو تایبەتمەندی (امتیاز)یەکی هەیەو لە هەموو خێروبێرێکی ئەم کوردستانەدا سوودمەند بووە، بەڵام پێشمەرگەی ئێمە لە هەموو شتێك بێ بەشە!! باشە ئەدی ناڵێن کوردایەتی و پێشمەرگایەتی! خۆ ئێمەش وەك ئەوان پێشمەرگە بووین و بە یەکەوە خەباتی ڕزگاری خوازیمان کردوە!.

یان باسی ئازادی دەکرێ، بەڵام تەماشادەکەین ئافرەت ئازادە بۆ ئەوەی خۆی ڕووت بکاتەوە، بەڵام ئافرەتە مسوڵمانەکە ئازاد نیە بۆ ئەوەی خۆی داپۆشێ! ئەدی کابرا تۆ ناڵێی ئازادیی؟! ئێ وەك چۆن خۆ ڕووت کردنەوە ئازادییە لە وڵاتێکی مسوڵمان‌نشین دا– کە ئەگەر دەستووری عێراق پیادە بکرێ نابێ ڕێگەی ئەوانەش بدرێ چونکە سووکایەتییە بە هەست و شعووری مسوڵمانان– بەڵام باشە ئەدی بۆچی دەبێ خۆداپۆشینی ئافرەتی مسوڵمان کێشەو گرفت بێ؟! بۆچی دەبێ بە پەندی (بانێکە و دوو هەوا) ڕەفتار بکرێ؟! وە هەروەها مەسەلەی ڕیش هێشتنەوەی گەنجان و هەندێك دیاردەی دیکەی وەك عیبادەتی زیاتر لە مزگەوتەکان دا، ئەوە هەمووی ڕێگەی لــێدەگیرێ لە هەدووك ئیدارەکەداو پێشێلکارییەکی زۆر لەو بارەوە هەیە، کە بەڕاستی دەبێ ئێمە لە بەرانبەر هەموو ئەوانەدا هەڵوێستمان هەبێ و ناڕەزایی دەربڕین، کاتێك کە هەژارێك نان بڕاو دەکرێت، کاتێك زوڵمێك لە ڕووی ئازادییەوە لە خەڵك دەکرێت وە دەبێ دڵنیا بین کە

**ناشەرعی یەکی گەورە کراوە! تەماشا دەکەین کەسێك لەسەر ئەوەی کە بابەتێك دەنووسێ و ڕەخنە لە دەسەڵات دەگرێ یەکسەر زیندانی دەکرێ، بەڵام کابرا قسە بەخوای پەروەردگار دەڵێ گوێی پێ نادەن!! ئێ کاکە ئایا تۆ ئەو کابرایەت پی لە خوا گەورەترە؟! ئەدی ئێمە ناڵێیـــن: دینی ئەو میللەتە ئیسلامە و ئێمە وەك میللەتی کورد مسوڵمانین! باشە بۆچی کابرا قسە بە خواو پێغەمبەر ﷺ دەڵێ، قسە بە ئیسلام دەڵێ، گاڵتە بە ئایەتەکانی قورئان دەکات، ناگیرێ و زیندانی ناکرێ ؟!**

**بەڵام بۆ نابێ قسە بە سەرۆکەکەی تۆ بڵێ؟! لەسەر خوای پەروەردگارو پێغەمبەر ﷺ تووڕە نی، بەڵام لەسەر سەرۆك و حیزبەکەی خۆت تووڕەی!!**

5- **مەســـەلەیەکی دیکە ئەوەیە کە لە لایەن کەســـانێکی ژێر سایەی و هەردووك ئیدارەی دوو حیزبی حوکمڕانەوە دژایەتی ئیسلامییەکان دەکرێ وەك گوتم زۆر جار بانگەشەی ئەوە دەکرێ کە بۆچی ئیسلامییەکان هەبن، بۆچی ڕێگا بە بوونی لایەنە ئیسلامییەکان دەدرێت ؟! کاکە هەموومان مسوڵمانین!! بەڵێ برادەر خۆیشی بە مسوڵمان دەزانێ و قسەش بە ئیسلام دەڵـــێ !!**

**لە کۆتایی ئەم تەوەرەیەشدا دەڵێم: ئێمە وەك ئیسلامی کە ڕەخنە لەم واقیعە دەگرین، دەبی ڕەخنە لە خۆشمان بگرین، بەڕاستی ئێمەش ساوایی و کرچ وکاڵی و کەموکووڕیمان زۆرە! بەڵێ خەڵك و جەماوەرەکەمان ئومێدی زۆری پێمانە و(انشاءالله) ئومێدەکەشی لە جێی خۆی دایە، بەڵام هەر دەبێ دان بە لاوازی و کرچ و کاڵیەکەماندا بهێنین، ئێستاش لەگەڵ دابێ خەڵکێکی زۆر نازانێ کە ئێمە دڵسۆزینی، خەڵکێکی زۆر هەر لەپاش پەردەی ڕەشەوە سەیرمان دەکات، ئێستاش خەڵك بەتەواوەتی نازانێ کە ئێمە بۆی دڵسۆزین و بە پشت بەستن بە شەریعەتی گشتگیر و دادگەری خوای کاربەجێ دەتوانین**

هـــەموو ئاوات و خولیاو ئاواتەکانیـــان بێنینە دی وێڕای مســـۆگەرکردنی بەهەشت و ڕەزامەندی خوا لە دوارۆژدا .

مەبەستم ئەوەیە ئێمە وەك پێویست نەچووینە نێو خەڵك و خەڵك وەك پێویست نامانناسێ و بە هەڵـــــە بۆیان وێنا کراوین! ئەو پڕوپاگەندەیەی کە دژیشمان دەکرێ لەبەر ئەوەی کە بۆ خۆمان زمانێکی گۆیامان نیەو ڕەنگێکی گەشمان نەخستۆتە بەرچاوی خەڵك زۆرجار خەڵك بەو پڕوپاگەندەو بانگەشە خراپانە بڕوا دەکات! چونکە هەر کەسێك بۆخۆی خۆی پێناسە نەکات بۆ خەڵك، بێگومان ئەگەر بە هەڵە وێنا کرا و بە دزێوی نیشان درا نابێ جگە لە خۆی گلەیی لە کەسی دیکە بکات!

## تەوەرەی سێیەم: لە داهاتوودا چی بکەین و چۆن بکەین؟!

بەر لەوەی دەست بە تەوەرەی سێیەمی باسەکەم بکەم بە پێویستم زانی وەك یاد کردنەوەیەکی برای بەڕێزمان (مامۆستا ناصح) ئەندامی مەکتەبی سیاسیی (کۆمەڵی ئیسلامیی) لە خوای پەروەردگار بپاڕێینەوە کە لە ڕیزی شەهیدان دا حیسابی بکات، وە پلەو پایەی بەرز بێت، وە سێبووریی و ئارامی زیاتر بەسەر دڵی هەموولایەکدا بە تایبەتی بنەماڵەو کەسوکاری بەڕێزیدا بڕێژیت، وە خوای بەخشندە هەموو لایەکمان سەرکەوتووبکاتویارمەتیمان بدات ئەوڕێیەی ئەو برا بەڕێزانەمان تیایدا گیانیان تەسلیمیخوای کاربەجێ

کردوە ئێمەش درێژە پێدەری بین وە بێ لادان و کۆڵدان و وەستان هەتا ئێمەش خوا پشتیوان بێ ڕووحەکانمان بە پاکی تەسلیمی خوا دەکەینەوە .

بەڕێزان لە تەوەرەی سێیەمی وتارەکەم دا باسی ئەوە دەکەین کە لە داهاتوو دا چی بکەین و چۆن بکەین؟! بێگومان دوو تەوەرەی یەکەم و دووەم کە ڕابردن وەك خوێندنەوەیەکی ڕابردووو ئێستامان بوون، بەلاّم ئایا ئێمە وەك (کۆمەڵی ئیسلامیی) بۆ داهاتوو کە خەڵکێکی زۆر هیواو ئومێدێکی زۆری پێمانە پێویستە چی بکەین و چۆن بکەین؟! کە خوای بەرز و مەزن لێمان ڕازی بی، وە خەڵکە مسوڵمانەکاشمان لەو ئومێد و هیوایەی کە بە ئێمەی هەیە بەهەڵەدا نەچووبێ بەڵکو ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر پێمان دڵخۆش و ئومێدەوارتر بێت .

جا من ئەم تەوەرەیە بۆ ئێوەی بەڕێز لە سێ خاڵی سەرەکی دا دەخەمە ڕوو کە هیوادرم زۆر بە سەرنجەوە وەك عادەتی هەمیشەیی خۆتان لەگەڵمدا بن، چونکە ئەوەی لەم تەوەرەی سێیەم دا باسی دەکەم پەیوەندی بە داهاتوومانەوە هەیە، پێویستە چی بکەین وە چۆن بکەین ؟!

## خاڵی یەکەم : چەند بنەمایەکی گرنگی کاری ئیسلامیی ( أساسيات للعمل الأسلامي ) :

لەم خاڵەدا ئاماژە دەکەین بە چەند بنەما و بنچینەیەك کە بە قەناعەتی من هەڵقوڵاوی قورئان و سوننەتن، وەلە ئەزموون (تجربة)ی جموجۆڵ و چالاکی لایەنە ئیسلامی یەکان وەلە ئەزموونی جموجۆڵی خۆشمانەوە وەردەگیرێن :

1. <u>پێویستە پێناسەیەکی ڕاست و دروستمان هەبێ بۆ کار و چالاکی ئیسلامیی :</u>

که دەڵێین کاری ئیسلامیی (العمل الأسلامي) ئیش کردن بۆ ئیسلام، مەبەستمان پێی چی‌یە؟! لە ڕاستی‌دا کاری ئیسلامیی جۆرێکە لە طاعەت و عیبادەت کە ئێمە بۆ خوای پەروەردگار ئەنجامی دەدەین کە بە بانگەواز دەست پێدەکات وە بنیات نان و دروست بوونی کیان و دەوڵەتی ئیسلامیی کۆتایی دێت، کاری ئیسلامیی واتە ئیش کردن بۆ ئەوەی کە ئیسلام بەرنامەی ژیان بێت ئیسلام بەوشێوەیە بێ لە ژیانی ئێمەدا کە خوای بە بەزەیی ویستوویەتی و فەرمانی پێکردوە، جا ئایا خوای بەخشەر ویستوویەتی کە ئیسلام چۆن بێ؟ دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا﴾ (المائدة -3) .

کەواتە: خوای پەروەردگار ویستوویەتی ئیسلام بەرنامەی ژیانی ئێمە بێت، چونکە ئەو ئایەتە لە حەجی ماڵئاوایی (حجة الوداع) دا هاتە خوارێ واتە کۆتا [9] حەجی پێغەمبەر ﷺ وە لە ڕۆژی جومعەدا وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە یەکێك لە جوولەکەکان بە عومەری کوڕی خەطابی گوت (خوا لێی ڕازی بێ): ئەگەر ئەو ئایەتە بۆ ئێمە دەهاتە خوارێ ئەو ڕۆژەمان دەکردە جەژن! عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: دەزانم ئەو ئایەتە لە چ ڕۆژێك و لە چ شوێنێکدا هاتە خوارێ، لە عەرەفە هاتە خوار کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ لە عەرەفات وەستا بوو لە ڕۆژی جومعە لە ساڵی دەیەمی کۆچی دا، خوای زاناو توانا ڕایگەیاندوە بۆ ئێمەی ئیماندار و موسوڵمان بۆ ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ و دەماندوێنێ و دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ ئەمرۆ دینەکەتانم بۆ تەواو کردن، بەرنامەی ژیانتان تەواو بوو، ﴿وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي﴾ چاکەی خۆمم بەتەواوەتی بەسەر ئێوەدا ڕشت، ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا﴾ ئیسلامیشم بۆ بەرنامەی ژیانتان پەسند کردوە.

---

(9) دیارەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها ئەو حەجەشی کردوە .

جا كەواتە كاری ئیسلامیی بریتیە لەو جموجۆڵ و كرد و كۆشەی كە ئینسانی مسوڵمان وەك تاك یان كۆمەڵی مسوڵمان وەك كۆ (جمع) ئەنجامی دەدەن تاكو خۆیان و خەڵك و دەوروبەریان بەشێوەیەك بژین كە بەپێی دینی خوا بەڕێوە بچن، تاكو خوای بێ وێنە و هاوتا لێیان ڕازی بێ، وە سەرەنجام لە تاقی كردنەوەی ژیانی دونیا سەربەرزانە دەربچن .

جا دیارە ئینسانی مسوڵمان ئەگەر كاریش بۆ ئیسلام نەكات هەر مسوڵمانە، بەو مانایەی كە كەسی وا هەیە لە توانای دا نیە خەڵك بانـــگ بكات بۆ ئیسلام، لە توانای دا نیە بۆ وێنە جەنگ و جیهادی ئیسلامیی بكات، یان ڕاستی یەكانی ئیسلام بۆ خەڵك ڕوون بكاتەوە، یان فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپە بكات، هەر بۆیەش لە پێناسەی كاری ئیسلامیی دا گوتوومانە جۆرێكە لە طاعەت و عیبادەت، وە هەر بۆیـــــەش ئێمە وەك (كۆمەڵی ئیسلامیی)–بە پێچەوانەی ئەوەوە كە زۆر جار ناحەزان بانگەشەمان بۆ دەكەن و پڕوپاگەندەمان لە دژ دەكەن – ئێمە تەنیا خۆمان بە مسوڵمان نازانین! بەڵكو ئێمە ئەو میللەت و كۆمەڵگایەش كە دەمانەوێ خۆمان و ئەوان زیاتر لە دینی ئیسلام تێبگەیەنین و زیاتر بەرەو ئیسلامیان بێنین، وە بەشێوەیەك بین كە شەریعەتی خوا بەسەر ژیانماندا حاكم بێت، خۆمان و ئەوانیش بە مسوڵمان دەزانین، بەڵێ ئێمە بە ئەركی سەرشانی خۆمانی دەزانین كە شەریعەتی خوای دادگەر بكەینە كاڵای باڵامان و بیكەینە بەرنامەی ژینمـــان وەك كە خوای پەروەردگار لەســـەری فەرز كردوین و فەرمانی پێكردووین .

2. هەرچەندە ئامانجی دوورو ستراتیژی كاری ئیسلامیی بریتی یە لە پێكهێنانی دەوڵەتی ئیسلامیی، وە پیادەكردنی شەریعەت، چونكە خوا وای فەرمووە و بەوە نەبێ لێمان ڕازی نابێ، بەڵام هەموو قۆناغەكانی كاری ئیسلامیی لە خودی خۆیاندا بە ئامانجی شەرعیی دادەنرین :

ئینسان چ وەك تاكێك كە دەچێ خەڵك فێری نوێژ و ڕۆژوو دەكات و فێری عیبادەت و ئەخلاقی ئیسلامی یان دەكات، فێری برایەتی و ماڵ بەخشینیان دەكات، فێری خزمایەتی و سیلەی ڕەحمیان دەكات. فێری ڕێزگرتن لە خۆ گەورەتریان دەكات و فێری بەزەیی هاتنەوە بە كەسانی لە خۆ گچكە تریان دەكات، هەموو ئەو شتانە كە مسوڵمان پێیان هەڵدەستێ چ وەك تاك چ وەك كۆمەڵ، لە خودی خۆیاندا ئامانجی شەرعین، كەواتە ئێمە با پێمان وانەبێ ئەگەر نەمانتوانی بگەینە دەسەڵاتی ئیسلامیی، نەمانتوانی بگەینە قۆناغی پێكهێنانی كیان و قەوارەیەكی ئیسلامیی و پیادەی بكەین لە وڵاتی خۆماندا با پێمان وانەبێ كە بە ئامانج نەگەیشتووین! لە ڕاستی دا هەر كارێكی ئیسلامیی كە دەكرێ لە خودی خۆی دا ئامانج (هدف)ە، بۆ نموونە: بانگەواز ئامانجێكی ئیسلامییە ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ﴾ (النحل –125) زۆرێك لە پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) تەنیا لە قۆناغی بانگەواز دا بوون و سەریان ناوەتەوەو نەگەیشتوونە قۆناغەكانی دیكە، بەڵام هەر پێغەمبەرانی خـواش بوون و هەر هەڵبژێردراوی نێو ئادەمیزادانیشن! ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنْ الْمَلاَئِكَةِ رُسُلاً وَمِنْ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ (الحج – 75)

كەواتە هەر كارێك لە كارەكانی ئیسلام و لەوانەی كە خواو پێغەمبەری خوا لە قورئان و سوننەت دا فەرمانیان پێ كردوون كە ئێمە لە خودی خۆماندا بیانكەین یان وا بكەین كە خەڵك بیانكات لە خودی خۆیاندا ئامانجی شەرعین، وە پێویستە لەسەریان مكوڕ بین وە ئەگەر نەگەیشتینە قۆناغی كۆتایی پێمان وانەبێ ڕەنج بەخەسار بووین!! ئەوەش خاڵێكی زۆر گرنگە بۆ ئەوەی هەر كارێكی ئیسلامیی گرنگیی خۆی پێ بدەین .

وە لە ڕاستیدا كاری ئیسلامیی وەك هۆ (وسیلة) تەماشا ناكەین بۆ پێكهێنانی دەوڵەتی ئیسلامیی بەڵكو شێوازەكانی كاری ئیسلامیی هەر شێوازێكی لەهەر قۆناغێكدا لە خودی خۆیدا ئامانجە، وەك چۆن پێكهێنانی

دەوڵەتی ئیســـــلامییش ئەوئامانجی کۆتاییی‌یە، ئەوانی دیکەش وردە ئامانج (هدف)ن .

ئنجا مەبەست و ئامانجیش لەکاری ئیسلامی ئەوەیە کە خەڵك دیندار بکەین و خواپەرست بکەین، خەڵك وا لــێ بکەین خواپەرستی و دینداریی بکات، ژیانەکەی بەو شــێوەیە بەڕێوەبــەرێ کە خوا پێی خۆشـــــە، هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەك خوای پەروەردگار لێیان دەگێڕێتەوە داوا لە قەومەکان دەکەن کە خوا بپەرستن بێجگە لە خوا پەرستراوێکی دیکەتان نیە ﴿ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ ﴾(الأعراف–59،65، 73،85) .

جا براو خوشکانی بەڕێز! ئەوە زۆر خاڵێکی گرنگە ئێمە ئامانجمان لە کاری ئیسلامیی ئەوەیە کە ئەو خەڵکەی پێمان وایە لە ئەوان شارەزاترین و بەرچاو ڕوونترین لە دینی خوادا وایان لێ بکەین خوا پەرست و دیندار بن تا خوا لێیان ڕازی بێ، وە بەختەوەری دنیا و سەرفرازی دوا ڕۆژ بن، واتە ئێمە ئیشی خۆمانمان بە خەڵك نیە بەڵکو ئیشی خۆیانمان پێیانە!

ئیشی ئەوەمـان پێیانە خۆیان بەختەوەربن، نەك بیانکەینە وەسیلەیەك بۆ خۆمـان وەك عادەتی طاغوتەکان و ڕێچکە و بیردۆزەکانیان! ئەوە زۆر خاڵێکی گرنگە!

بەڵێ ئێمە لە چوارچێوەی لایەنێکی ئیسلامیی دا کار دەکەین لەبەر ئەوە کە بەو هۆکارە نەبێ واقیعمان پێ ناگۆڕێ ، نەك ئەوە کە ئێمە خەڵکمان وەك وەسیلە و ئامراز (اداة) پێویست بێ بۆ مەرامێکی تایبەتی خۆمـان، نەخێر تەنیا ئیشی خۆیانمان پێیانە، ئیشی ئەوەمـان پێیانە کە لە دونیادا بەختەوەر بن و لە دواڕۆژدا سەرفراز بن، ئێمەش پاداشتێکمان دەست دەکەوێ لەبەر ئەوەی بەبەشێك لە دینداریی و تاعەتێك کەلەسەر شانمانە هەستاوین .

4- <u>بنەما و حەقیقەتێکی دیکە لە کاری ئیسلامیی دا ئەوەیە کە هەمیشە گۆڕینی نەفس بناغەیە بۆ گۆڕینی واقیع</u>

خـــوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ (الرعد–11)

واتە: خوا واقیعی هیچ گەل و کۆمەڵگایەك ناگۆڕێ تاکو واقیعی دەروونی خۆیان نەگۆڕن .

بەڵێ گۆڕان لە نەفسەوە دەست پێ دەکات، کەواتە دەبێ ئێمە تەماشای ئەوە نەکەین کەی دەسەڵات بەدەستەوە دەگرین! بۆیە لە ئیسلامدا بە چەك و هێز و زەبر و زەنگ دەسەڵات فەرز کردن بەسەر خەڵکدا ڕەوا نیە، بەڵکو دەبێ لە بانگەواز و تێگەیاندن و پێگەیاندنی خەڵکەوە دەست پێ بکرێ! لەوەوە کە خەڵك خوای خۆی بناسێ و بیپەرستێ، بەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێ، تێبگات کە خوا بۆچی دروستی کردوە، ڕێککەون یەککەون بە یەکدەنگی‌یان زۆرینەی خەڵك بڕیار بدرێ کە شەریعەتی خوا لە ژیانی خۆیاندا حاکم بکەن .

پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا دڵ و دەروونەکان(أنفس)ی خەڵکی مەدینەی نەگۆڕی نەیتوانی واقیعی خەڵکی مەدینـــە (یثـــرب) بگۆڕێ ! نوێنەرانـــی ئەوس و خەزرەج مسوڵمان بوون وهاتن پەیمانیان بە پێغەمبەردا ﷺ دوای ئەوەی کە پێشتر (مصعب بن عمیر)ی ناردبوو (خوا لێی ڕازی بێ) بانگی کردبوون بۆلای خوا و ئیسلامی تێگەیاندبوون، وەك لە سیرەی (ابن هاشم)دا دەڵێ: (مابقیت دار من دور الانصار الاو دخلها الاسلام) دوای ئەو نوێنەرانی یەثریب هاتن و پەیمانیان بە پێغەمبەردا ﷺ کە بیکەن بە براگەورەو سەرۆکی خۆیان و ئەویش بچێ لە شاری مەدینە دەوڵەتی ئیسلامیی دامەزرێنێ !!

نەك بچێ بە زۆر بە چەك و سوپا ئیسلامیان بەسەردا فەرز بکات، ئەوە دروست نیە لە ئیسلامدا .

کەواتە گۆڕینی نەفس بناغە (أساس)یە بۆ گۆڕینی واقیع بەڵام دیسان گۆڕینی واقیعیش کار دەکاتە سەر گۆڕینی خەڵك! بۆیە ئیسلام دەڵێ دەبێ

دەوڵەت هەبێ! ئیسلام دەڵێ دەبێ کار بکرێ بۆ ئەوەی حوکمڕانی بەدەست ئەهلی ئیمانەوە بێ، چونکە هەرکاتێك ئیسلام دەسەڵاتی هەبوو فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە زۆر باش دەکرێ، ڕاستی یەکانی ئیسلام زۆر باش ڕوون دەکرێنەوە، بیروڕا پووچەکان ئاسانتر دەپووچێنەوە، کەش و هەوایەکی پاك دروست دەبێت کە خەڵك دینداریی تێدا بکات و ژیانێکی مسوڵمانانەی تێدا بگوزەرێنێت! بەڵێ گۆڕینی واقیعیش دیسان کاریگەری دەبێ لەسەر گۆڕینی دەروونەکان، بەڵام گۆڕینی نەفس بناغەیە بۆ گۆڕینی واقیع .

4. پاڵنەر و هاندەری کاری ئیسلامیی بریتییە لە بەزەیی و پەرۆش بۆ خەڵك :

ئێمە بۆیە خەڵك بانگ ناکەین بۆ ئیسلام ڕقمان لێیان بێت، ئێمە بۆیە کاری ئیسلامیی ناکەین ڕقمان لە خەڵك و کۆمەڵگاو دەوروبەرمان بێت، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە بەزەیی مان پێدا دێن و خۆشمان دەوێن ، دەمانەوێ ئەو نیعمەتەی کە خوا (تبارك وتعالى) ئێمەی لێ بەهرەمەند کردوە ئەوانیشی لێ بەهرەمەند بکەین!

من شتێکی خۆشتان بۆ بگێڕمەوە، جارێك ئەوە بوو لە یەکێك لە شارەکانی کوردستان پێشتر بارەگامان هەبوو، بەڵام دوایی کێشەیەك پەیدا بوو بارەگاکەمان نەما، دوای چارەسەری کێشەکە بارەگاکەمان بۆ شوێنی خۆی گەڕابۆوە، منیش چووم بۆ پیرۆزبایی لێکردنیان، لە سەردەمی (بزووتنەوەی ئیسلامیی) پێشوودا، لافیتەیەکیان هەڵواسیبوو لێی نووسرابوو: با دوژمنانی ئیسلام بزانن کە بزووتنەوەی ئیسلامیی هەر دێتەوە! گوتیان مامۆستا ئەو لافیتەیەت پێ چۆنە؟ گوتم: باشە بەڵام یەك وشەی لێ بگۆڕن ئەویش ئەوەیە لەجیاتی دوژمنانی ئیسلام بنووسن دۆستانی ئیسلام ئەوکات ئاوای لێ دێت: (با دۆستانی ئیسلام بزانن کە بزووتنەوەی ئیسلامیی هەر دەگەڕێتەوە) گوتیان کەوابێ درووشمەکەمان هەڵدەگەڕێتەوە، گوتم: جا ئەگەر

هەڵگەڕێتەوە ئەوکات ڕاست و دروستە! گوتیان چۆن؟ گوتم: بەو شێوەی نووسیوتانە یەکسەر خەڵك ئەو سەرنجەی لـێوەردەگرێ کە: ئەو خەڵك و کۆمەڵگایەی دەوروبەرتان هەمووی بە دوژمنی خۆتان و دوژمنی ئیسلام دەزانن و پێیان دەڵێن: هەرچەندە پێتان ناخۆشەو ناحەزیشمانن بەڵام هەر دێینەوە!! بەڵام ئەگەر وەك من دەڵێم بنووسن: (با دۆستانی ئیسلام بزانن .....) ئەو کات ئەوە دەگەیەنێ کە: ئێوە هەموو دۆستن ئێمەش ئێوەمان خۆش دەوێ بۆیە دێینەوە نێوتان !!

بەڵێ برایان خوشکان دەبێ ئێمە بەو ڕووحیەتەوە کاری ئیسلامیی بکەین، ئێمە خەڵکی مسوڵمانی خۆمانمان خۆش دەوێ، وە ئەوەی کە مسوڵمانیش نەبی بەزەیی مان پێدا دێتەوە، مرۆڤایەتی دوای ئەوەی کە محمد المصطفی ﷺ هاتووە هەمووی ئوممەتی (محمد)ە، جا هەیە ئوممەتی بەدەنگەوە هاتوو (مستجیب)ە و هەیە هەر ئوممەتی بانگکراو (مدعو)ە، هەیە بەدەم بانگی پێغەمبەرەوە هاتوە و هەیشە بەدەم بانگەکەیەوە نەهاتوە بەڵام هەر بانگ کراوە، بە بەڵگەی ئەوەی کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ : ﴿ قُلْ يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾ (الأعراف –158)

واتە : (ئەی موحەمەد) بڵێ ئەی خەڵکینە! من پێغەمبەری خوام بۆ هەمووتان وێکرا .

بەڵێ تێکڕای مرۆڤایەتی لەدوای ئەوەی کە (محمد المصطفی) هاتوە هەمووی لەسەر میلاکی (محمد)ە جا ئەوەی بەدەم بانگیەوە هاتوە مسوڵمانەو ئەوەی بەدەم بانگیشیەوە نەهاتوە لەسەر کوفر ماوەتەوە، بەڵام ئەویش هەر دیسان بانگ کراوە .

ئێمە دەبێ بەو چاوە لە خەڵك بڕوانین و کاری ئیسلامیی بەو هاندەرە بکەین کە ئێمە شتێکمان پێیەو دەمانەوێ ئەوانی لێ بەهرەمەند بکەین، نەك

لەڕووی بوغز و قین و جێ بە خەڵك لێژ كردن و هەوڵدان بۆ شوێن گرتنەوەی ئەوان .

5. مەبەست (غاية) لە كاری ئیسلامیی بریتی‌یە لە ڕازی كردنی خوا- جل شـــــــأنه -:

بۆیە ئینســـانی مسوڵمان، وە كۆمەڵی مسوڵمان هەمیشـــــە مەبەست (غایە)كەی مسۆگەرە، بۆچی؟ چونكە تۆ كە یەكەم هەنگاوت نا لە پێناوی خوادا خوای بەخشندەدا پاداشتەكەت بۆ دەنووسێ با نەشگەیە ئامانج و با لە نیوەی ڕێگاش مردن یەخەت پێ بگرێ، بۆیە دەبینین خوای پەروەردگار لە سوڕەتی (ألنساء)دا دەربارەی ئەوانەی لە پێناو خوادا كۆچیان كرد دەفەرموێ:
﴿ وَمَنْ يَخْرُجْ مِنْ بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ ﴾ (100)

واتە : هەركەسێك لە پێناوی خوا لەپێناوی ڕازی كردنی خوادا لە مــاڵی خۆی بچێتە دەر دوایی مردن بیگرێ و بیگاتە سەر ئەوە پاداشــــــتی لەسەر خوایە .

جا براو خوشكەكانم! با ئێمە دڵخۆش بین، ئەگەر ئێمە دڵسۆز بین وخۆمان بۆ خوا یەكلا كردبێتەوە لە دڵەوە، مەبەستێكی دنیایی مان نەبێت تەنیا ئەوە نەبێت كە خوا لێمان ڕازی بێت، لە تاقی كردنەوەی ژیانی دونیادا سەربەرزانە دەرچین، وە ڕووی ئەوەمان بێت لە ژێر ئاڵا (عَلَم)ی پێغەمبەردا ﷺ حەشر بكرێین، تەنیا ئەوە پاڵنەرمان بێ، ئەوە مەبەست(غاية)ە مان هەمیشە مسۆگەرە، ئەگەر ئیش و كاری دنیاشمان نیوە چڵ بێ و لە نیوەی ڕێگاشدا بمرین و بكوژرێین، هەر شتێكمان لێ بەسەرهات مەبەست(غاية)ەكەمان هەر مسۆگەرە، مەبەستیش لە ئیسلامدا هەر ئەوەیە كە ﴿ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنْ اللَّهِ وَرِضْوَانًا و رضوانا﴾ (الفتح –29) فەزڵی خواو ڕەزامەندی خوا دەخوازن، فەزڵی

خوا بریتی یە لە بەخشش و بەهەشتی ڕازاوە، ڕەزامەندیی خواش لە هەموو شتێك گەورەترە ﴿وَرِضوانٌ مِنَ اللهِ أكبر﴾ (التوبة –72) .

## 6. کاری ئیسلامیی هیچ کاتێك لە تاقی کردنەوە (ابتلاء) خاڵی نابێت :

بەڵێ با پێمان وانەبێ دەتوانین ئیش بۆ ئیسلام بکەین و تووشی ناڕەحەتی و دەردەسەری نەبین!! ئەوەش حەقیقەتێکـــە زۆر لە ئایەتەکانی قورئان ڕوونیان کردۆتەوە و داکۆکیان لەســەر کردوە، بۆ وێنە خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ :

﴿ الم، أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لاَ يُفْتَنُونَ﴾

(العنكبوت –1،2).

واتە : ئەلیف . لام . میم، ئایا خەڵکی پێیان وایە تەنیا بەوەندە کە دەڵێن ئیمانمان هێناوە وازیان لـێدەهێنرێ بێ ئەوەی تاقی بکرێنەوە؟!

واتە هەرگیز شتی وانابێت .

هەروەها لوقمان خوا لێی ڕازی بێ کە خوا حیکمەتی پی بەخشیبوو، ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات وەك خوای بەرز و بێ هاوتا لێی دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ﴿ يَابُنَيَّ أَقِمْ الصَّلاَةَ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنْ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ ﴾ (لقمان –17)

واتە: کوڕیشکەکەم! نوێژ بەرپا بکەو فەرمان بە چاکە بکەو ڕێ لە خراپە بگرەو خۆڕاگریش بە لەسەر ئەوەی کە بەسەرت دێ .

واتە هەرکەسێك فەرمان بە چاکە بکات و ڕێگریی لە خراپە بکات و بیەوێ خوا لە خۆی ڕازی بکات، بە تەئکید دەبێ خۆڕاگر بێ چونکە تووشی ناڕەحەتی و دەردەسەریی دێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو گرفتاری و تاقی کردنەوانەی دێنە ڕێگامان سزای هەڵەکانمان نەبن!! چونکە مەرج نیە هەر مسوڵمانێك تووشی گرفتــاریی و ناڕەحـــەتی یەك بوو، ئەو گرفتاریی و ناڕەحەتی یە هەلقولاوی دینداری یەکەی بێت !

جاری وا هەیە هەڵقوڵاوی لادانیەتی لە ڕێبازی شەرع، هەڵقوڵاوی هەڵەو کەموکووڕییەکانی خۆیەتی، بۆیە دەبێ وریابین، جاری وایە لایەنێکی ئیسلامیی، کۆمەڵە مسوڵمانێك تووشی باجێکی قورس و ناڕەحەتی یەکی زۆر دێن لەبەر ئەوەی لە شەرع لایانداوە ڕەچاوی یاساکان (سنن)ی خوای پەروەردگاریان نەکردوە، چونکە ئەو کەسەی ڕەچاوی یاساکانی شەرع ناکات لەگەڵ ئەو کەسەی ڕەچاوی یاساکان (سنن) ی خوا ناکات هەردووکیان گوناحبارن، وەك چۆن کەسێك بەبێ دست نوێژ نوێژ بکات گوناحبارە، کەسێکیش مەلەکردن نەزانێ و خۆی لە دەریا باوێ هەر گوناحبارە، ئەوەی کە بەبێ دەست نوێژ نوێژ دەکات پێچەوانەی حوکمێکی شەرعی جووڵاوەتەوە کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ئەگەر هەستان بۆ نوێژ دەست نوێژ بگرن[10]، ئەو کەسەش کە بەبێ ئەوەی مەلە بزانێ خۆی لە دەریایەك دەهاوێ پێچەوانەی یاسا (سنة)یکی خوا جوڵاوەتەوە چونکە خوا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێ: ئەگەر ویستت شتێك بکەی دەبێ هۆکار (سبب)ی بۆ ساز بکەی وەك لە بارەی (ذوالقرنین)ەوە فەرموویەتی : ﴿ وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴾ (الكهف – 84) .

جاری وا هەیە مسوڵمان تووشی باج دانێکی گەورە دێت، تووشی کێشەو گرفتێکی گەورە دێت لەبەر ئەوەی پێچەوانەی یاسایەکی خوایی دەجووڵێتەوە و واقیع بین نەبووە، توانای خۆی نەزانیوەو هەل و مەرجەکەی خۆی نەناسیوە، یان لەبەر ئەوەی لە یاساکانی شەرع لایداوە، بەڵام دەبێ دڵنیابین کە ئێمە هەرچەندە حەکیم و لێزان بین تووشی تاقی کردنەوە هەر دێین !

بە بەڵگەی ئەوەی کە هیچ کەسێك لە پێغەمبەران (علیهم الصلاە والسلام) لێزانتر نەبووە، هیچ کەسیش لەوان بەربەڵاترو تاقی کراوەتر نەبووە!

---

(10) مەبەست ئایەتی ژمارە (6)ی (المائدة)یە کە خوای زانا لە سەرەتایەکەوە فەرموویەتی : ﴿ يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ فَاغسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ ﴾

وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (ان أشد الناس بلاْءً الانبياء ثم الأمْثَلُ فالأمْثَل ..) رواه البخاري .

واتە : بێگومان پێغەمبەران لە هەموو كەس تاقی كردنەوەیان سەخت ترە، ئنجا پێ بە پێ (واتە كێ زیاتر وەك پێغەمبەران بچێ تاقیكردنەوەكەی قورستر دەبێ) .

كەواتە خۆ لەبەر بێ حیكمەتی نەبووە كە پێغەمبەران تووشی ناڕەحەتی بوون، بەڵكو لەبەر زێدە سەر ڕاستی و مەبدەئی بوونیان بووە، بەڵێ ئێمە ئەگەر سەر ڕاست و مەبدەئی بین تووشی تاقی كردنەوەی زۆر دێین، بەڵام گرنگ ئەوەیە عاقڵ و لێزان بین كێشەو گرفت و ناڕەحەتی یەكانمان لەبەر هەڵەو كەموكوڕی‌یەكانمان نەبن، ئەگەر نا دەبێ ئەوە لای ئێمە شتێكی ڕوون و سەلمێنراو بێ كە تەنیا ئیمان بە خوا بوونمان بەسە بۆ ئەوەی دژایەتیمان بكرێ! بەبەڵگەی ئەوە كە خوای بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿مَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلاَّ أَنْ يُؤْمِنُوا بِاللَهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (البروج -8)

واتە : (ئەصحاب الاخدود كاتێك ئەو كۆمەڵە مسوڵمانانەیان سووتاند) هیچ شتێكیان لێ بە ڕەخنە نەگرتبوون تەنیا ئەوە نەبێ كە ئیمانیان هەبوو بە خوای زاڵی ستایش كراو .

بەڵێ تەنیا ئیمان هەبوون بە خوا بەسە بۆ ئەوەی ئەهلی كوفر دژایەتیمان بكەن، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەسەر ئیمان دژایەتیمان بكەن نەك لەسەر هەڵەو كەم و كووڕی‌یەكان و لەسەر لادان لە شەرع و لادان لە یاساكانی خوا كە لە ژیان و بوونەوەردا دایناون .

7. <u>كاری ئیسلامیی هەرچەندە بە تاك(فرد)یش دەكرێ و هەموو مسوڵمانێ لەسەری پێویستە بەپێی توانای خۆی ئیش بۆ ئیسلام بكات، بەڵام بە ڕاستی لە كاتێكدا مسوڵمانان دەوڵەتیان نامێنێ وەك واقیعی ئێستای ئێمە، كاری ئیسلامیی پێویستی بە ڕێكبوون و ڕێكخستن و كۆمەڵبوون</u>

**هەیەو دەبێ مسوڵمانان ڕێك و پێك و كۆمەڵ بن وەك چۆن پێغەمبەر كاری ئیسلامیی خۆی بەوپەڕی ڕێك و پێكی و بە كۆمەڵ ئەنجام داوە :**

بەڵێ دەبێ بزانین كە كاتی خۆی دەوڵەتی ئیسلامیی هەبووە، زانایانی ئیسلام بۆیە بەوەندە ئیكتیفایان كردوە كە وەك كارێكی تاكی فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپە بكەن، هۆیەكەی ئەوەبووە كە دەوڵەتی ئیسلامیی هەبووە، بەڵام كاتێك دەوڵەتی ئیسلامیی نامێنێ، دەبێ مسوڵمانان سەر لە نوێ بناغە دابنێنەوە بۆ كیان وكۆمەڵگای ئیسلامیی و كیان وكۆمەڵگای ئیسلامییش بە كۆمەڵكاریی و پێكەوە هۆنینەوە و ڕێكخستن نەبێ، نایەتە دی و بنیات نانرێ(یەتر).

8. **بنەمایەكی دیكەی كاری ئیسلامیی ئەوەیە كە دەڵێین ئێمە لایەنێكی ئیسلامیی یاخود (كۆمەڵێكی ئیسلامیی)ن لەبیرمان نەچێ كە ئێمە بەشێكین لە مسوڵمانان و ئیسلام لە ئێمەدا كورت هەڵنەهاتوە !**

چونكە هەندێك كەس ئەوەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی سەردەمی خۆمانی لێ تێكەڵ دەبن و دەڵێ: باشە بۆچی لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی لەگەڵ ئەودا نەبووە لە دەرەوەی بازنەی ئیسلامدا حیساب كراوە؟ ئاخر لەبەر ئەوە كە پێغەمبەر ﷺ یەكسان بووە بە ئیسلام و هەركەسێك ئیمانی بە پێغەمبەر ﷺ نەبووبێ مسوڵمان نەبووە، ئێستاش هەركەسێك ئیمانی بە پێغەمبەر ﷺ نەبێ مسوڵمان نیە، بەڵام ئێستا مەرج نیە كە كابرا لەگەڵ ئێمە نەبوو مسوڵمان نەبێ!

دەبێ بڵێین: ئێمە بەشێكین لە مسوڵمانان وەك خوای زاڵ و بە توانا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنْ الْمُسْلِمِينَ﴾ (فصلت –33) پاشان دەبێ وریا بین خۆمان لە خەڵك بە

---

(11) لە كتێبی : (ئیسلام و مسوڵمانەتی و كاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا) دا كە ئێستا لەژێر چاپ بە تێر و تەسەلی لەو بارەوە دواوین.

چاكتر نەزانين و خۆمان لە خەڵك بە پاكتر نەزانين ، بەڵكو دەبێ هەوڵ بدەين بە كردەوە پاكترو چاكتر بين نەك بە زمان، وە خەڵك بە گوناحبارو عەيبدارو گومڕاو و سەرلێشێواو حيساب نەكەين و تەماشا نەكەين، چونكە خەڵك نەفسيەتى وايە- براو خوشكەكانم ! هەركەسێك خۆى لە خەڵك بە زياد زانى و خۆى لەوان بەچاكتر دانا بێگومان خەڵك بە چاى سووك سەيرى دەكەن و گوێى بۆ ناگرن .

جگە لەوەش ئێمە دەبێ هەميشـــە خۆمان بە گوناحبـــار بزانين لە بەرانبەر خوادا، كێ دەڵێ ئەو مسوڵمانەى تۆ بانگى دەكەى ئەو لە تۆ دڵى سـافتر نيە لەگەڵ خوا؟! تۆ زانياريت هەيە ئەو زانيارى نيە، نازانێ، يان كێ دەڵێ سەرەنجامى وى لە هى تۆ باشتر نابێت ؟!

9. **بنەمايەكى ديكە ئەوەيە كە خۆشويستنى گەل و نيشتيمانمان بە شتێكى سروشتى و فيطرى دەزانين:**

بەڵێ ئێمە خەڵك و گەل و نيشتيمانى خۆمانمان خۆش دەوێ و ئەوەش بە بەشێك لە ديندارىى و مسوڵمانەتيمان دەزانين، چونكە ئێمە ئەگەر ولاتێكى ئازادمان نەبێت وميللەتێكمان نەبێ ڕزگار و سەربەخۆ بێ ناتوانين شەريعەتى خوا پيادە بكەين، بەڵێ دەتوانين ديندارىى شەخسى بكەين لە كونجى زيندانێكيشدا، بەلاّم ئايا دەكرێ شەريعەت پيادە بكرێ ئەگەر سەر زەمينەكەت ئازاد نەبێ و خەڵكەكەت ڕزگار نەبێ؟! بێگومان نەخێر .

لەبەر ئەوە با مەجال نەدەين خەڵك موزايەدەى نيشتيمانپەروەرێتى و نەتەوايەتيمان بەسەرەوە بكات! نيشتيمانپەروەێتى ئەگەر بريتى بێ لە خۆشويستنى ولاتى خۆمان بۆ ئەوەى دينى خواى لەسەر بچەسپێنين، وە ئەگەر نەتەوايەتى بريتى بێ لە خۆشويستنى ميللەتى خۆمان بۆ ئەوەى شەريعەتى خواى بەسەردا جێبەجێ بكەين، ئەوە بە بەشێك لە مسوڵمانەتيمانى دەزانين،

(هەرکەسێك وڵاتێکی ئازاد و گەلێکی رزگاری نەبێ بەڕاستی ناتوانێ شەریعەتی خوای بەسەردا جێبەجێ بکات)!

بەڵام دەبێ وریا بین خۆمان کورت هەڵنەهێنین لە قەپێلکی نەتەوەکەمان دا! وە خەڵکی دیکەمان ڕق لـێنەبێتەوە لەبەر ئەوەی لە ڕووی نەتەوەییەوە لە ئێمە جیان، پاشان لەبیرمان نەچێ کە بناغەی دۆستایەتی و دوژمنایەتی ئیمان و ئیسلامە، کێ لە ئیمان و ئیسلامدا لەگەڵمان یەك بگرێتەوە دۆستمانەو خۆشمان دەوێ و کێ لە ئیمان و ئیسلامدا لەگەڵمان یەك نەگرێتەوە خۆشمان ناوێ و دۆستمان نیە، ڕێزی دەگرین وەك هاوڵاتی بەڵام ناتوانین دۆستایەتیی بکەین بەو واتایەی خۆشت بوێ و بە پشتیوانی خۆتی بزانی و پشتگیری بکەی، دۆستایەتی (موالاة) مان تەنیا لەگەڵ ئەهلی ئیمان دایە وەك خوا فەرموویەتی: ﴿لاَ يَتَّخِذْ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنْ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلاَّ أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمْ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾ (آل عمران -28) دۆستایەتی (موالاة) مان تەنها لەگەڵ ئەهلی ئیمان دایە بەڵام گونجان و مەدارکردنمان لەگەڵ هەموو خەڵك دایە وەك پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە بووە .

## 10. بەبێ تەفاعول کردنی ئیجابی لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگادا کاری ئیسلامیی سەرو بەر ناکرێت :

ئەگەر بمانەوێ کۆمەڵگا بگۆڕین، بمانەوێ واقیع بگۆڕین، دەبێ بچینە نێوی و بە تەواوی مانا کارلێك (تفاعل)ی لەگەڵدا بکەین ، دەبێ خەڵکەکە بتناسێ و بیناسی، بە دەرد و ئێش و ژانەکانی ئاشنا بی، دەبێ بە دڵسۆزت بزانن و بە دۆستت بزانن، بە کردەوە و هەڵوێستیش بیسەلمێنی کە بۆیان دڵسۆزی و بە خەمیانەوەی!

بۆیە دەبێ ئێمە لەگەڵ هەموو شتێکی حەقی هەرکەسێکدا بین! بۆ وێنە برادەرانی (یەکێتی) یان (پارتی) شتێکی باش دەڵێن، کارێکی باش دەکەن

که له قازانجی خه‌ڵك و کۆمه‌ڵگا دایه، له‌گه‌ڵی ده‌بین! (حیزبی شیوعی)ش شتێکی باش و به‌سوود و قازانج بۆ خه‌ڵك و کۆمه‌ڵگا پێشنیار بکات له‌گه‌ڵی داده‌بین !

یه‌کێ له زانایانی مسوڵمانی هاوچه‌رخمان له‌و باره‌وه فه‌تواو قسه‌یه‌کی هه‌یه ده‌ڵێ: مسوڵمانێك که له وڵاته ئه‌ورووپی و ڕۆژئاواییه‌کاندا ده‌ژیت واته له کۆمه‌ڵگایه‌کی نامسوڵماندا، ئه‌گه‌ر دوو حیزب هه‌بن هه‌ردووکیان حیزبی نه‌صرانی یا عه‌لمانی بن، ئایا دروسته به‌شداریی بکات ؟! ده‌ڵێ: به‌ڵێ، با ته‌ماشا بکات کامیان له‌و دوو حیزبه زیاتر شتی وا ده‌ڵێ که به قازانجی مسوڵمانان و قازانجی خه‌ڵك ته‌واو ده‌بێ پێویسته ده‌نگ بۆ ئه‌ویان بدات[12].

مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه که ئێمه پێویسته تێکه‌ڵ بین و کارلێك (تفاعل) بکه‌ین له‌گه‌ڵ خه‌ڵك و میلله‌ته‌که‌مان، ئه‌وه‌ش به‌وه ده‌کرێ له‌گه‌ڵ هه‌موو شتێکی حه‌قیان دا بین، به‌ڵکو ده‌بێ دستپێشخه‌ر بین بۆ هه‌موو شتێکی هه‌ق و چاك! ئنجا براو خوشکه‌کانم! به‌ڕاستی له به‌سه‌رهاتی یوسف پێغه‌مبه‌ردا (علیه الصلاه والسلام) په‌ند و وانه‌یه‌کی زۆر گه‌وره هه‌یه، کاتێك خه‌ونه‌که بۆ پاشای میسر مانا ده‌کات پێی ده‌ڵێ: ﴿ قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴾ ( یوسف -55 ) ده‌یه‌وێ ببێته وه‌زیری بازرگانی یان وه‌زیری ئابووری له نێو میلله‌تێکی کافردا به‌ڵام به‌وکاره‌ی ده‌یه‌وێ خزمه‌تێك به‌و خه‌ڵکه بکات بۆ ئه‌وه‌ی چاکه‌ی له چاویاندا هه‌بێت، که ئه‌وه‌ش یه‌کێکه له شێوازه‌کانی بانگه‌واز بۆ لای خوا، چونکه دوایی خه‌ڵکه‌که ده‌ڵێن (یوسف) که خواپه‌رستێکه ئه‌و چاکه‌یه‌ی له‌گه‌ڵ کردین ! که‌واته ده‌بێ چاکه کردن له‌گه‌ڵ خه‌ڵك – هه‌تا ئه‌گه‌ر خه‌ڵکی نامسوڵمانیش بێ – بکه‌ینه یه‌کێك له شێوازه‌کانی دینداریی وخه‌ڵك بانگکردن بۆ لای خوا .

---

(12) بڕوانه: (قضایا فقهیة معاصرة) که هی (د. عبدالکریم زیدان)ه .

**11. بنەمایەکی دیکەی کاری ئیسلامیی ئەوەیە ئێمە دەبێ هەمیشە ڕەخنە لە واقیع بگرین کاتێك کە ناشەرعیی و هەڵەو کەموکووڕیی دەبینین، بەڵام دەبێ دادگەر بین و وەك چۆن عەیب و ناتەواویەکانی خەڵك دەبینین دەبێ چاکەکانیشیان ببینین :**

بۆ وێنە ماقوڵ نیە ئێمە بڵێین (پارتی و یەکێتی) هیچیان نەکردوەو هیچ چاکەیەکیان نیە، نەخێر وانیە، خەڵکێکیان هەیە دڵسۆزە و کاری چاکیان کردوە! کوردستان تا ڕادەیەك ئاوەدانی پێوە دیارە و کەم و زۆر خزمەتگوزاریی ئەنجام دراوە و پڕۆژەی باش باش پێشکەش کراون، ئەوانە هەموو ئیشی باشن و خزمەتن بە خەڵك، ئێمە با بە ئیشە باشەکانی خەڵك بلێین باش، ڕەخنەش لە خراپەو کەموکووڕییەکانیان بگرین .

ئەوە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەشەوە با ڕەخنە گرتنمان لە ڕووی دڵسۆزییەوە بێت نەك لە ڕووی ڕق و قین و بوغزەوە! چونکە لە ڕووی بوغز و غەرەزەوە خەڵك بە قسەکردن و ڕەخنە لێگرتن قەڵس دەبێ، بۆیە دەبێ لە ڕووی دڵسۆزی و پەرۆشەوە بێ، واتە ڕەخنەکانمان بنیاتنەر بن، کە ئەوەش یەکێکە لە هۆکارەکانی تێکەڵ بوون و کارلێك ( تفاعل) کردنمان لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگا، چونکە کاتێك خەڵك زوڵمی لێ بکرێ، خراپە بکرێ، تۆ هیچ هەڵوێستێکت نەبێ، چۆن تەفاعول دەکەی و چۆن خەڵك بزانێ تۆ لە وڵاتدا هەی یان نی؟! یاخود چۆن بزانێ تۆ دروشمت چی یەو بەرنامەت چی یە؟! ئێمە زۆر جار شت دەکرێ، چاك، خراپ، کەچی هیچ هەڵوێستمان نیە! نە لە بواری ڕاگەیاندن، نە لە بواری سیاسی، نەلە بواری دیبلۆماسی، بێگومان ئەوە هەڵەیە، ئاخر چۆن واقیع دەگۆڕێ کە تۆ لەو بوارانەدا لەگەڵی تێکەڵ نەبی؟!

**12. بنەمایەکی دیکە ئەوەیە کە ئێمە داکۆکی بکەین لەسەر حاکمیەتی شەریعەت نەك حاکمیەتی خۆمان:**

شتێکی زۆ هەڵەیە مسوڵمان بە بابای حوکمڕان بڵێ: من کێشەم لەگەڵ تۆ هەیە لەبەر ئەوەی تۆ لەسەر کورسییەکەی نەك من!! بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ قوڕەیش ئامادەبوون بیکەن بە پاشا (ملك)، کاتێك کە (عتبة بن ربیعە)یان بە نوێنەری خۆیان ناردەلای، یەکێك لە پێشنیارەکان ئەوە بوو کە پێیان گوت: (وان کنت ترید الملك ملکناك علینا)[13] فەرمووی نەخێر من ئەوەم ناوێ .

بەڵێ ئێمە کێشەمان لەگەڵ خەڵك ئەوە نیە کە ئەوان لەسەر کورسین و ئێمە لە خوارەوەین! با ئەو هەر لەسەر کورسی بێت بەڵام شەریعەتی خوا پیادە بکات! ئێمە کێشەمان حاکمیەتی شەریعەتە نەك حاکمیەتی خۆمان، ئەوە خاڵێکی زۆر گرنگە، ئێمە بەڕاستی ئامانجمان ئەوەیە شەریعەتی خوا پیادە بکەین، چونکە ئەگەر شەریعەتی خوا حاکم بێت خوا لە ئێمە و لەو خەڵکەش ڕازی دەبێت، وە دادگەریی دەچەسپێت خراپە لادەچێ، خەڵك و کۆمەڵگا ئاسوودەو بەختەوەر دەبێ، ئەوەش ئامانجی دینی خوای پەروەردگارە .

13. <u>ئێمە دەبێ لە کار ئیسلامیی ماندا هەوڵ بدەین هەم شەرعزان بین و هەم واقیع ناس بین :</u>

بێگومان بەبێ شارەزایی لە قورئان و سوننەت ناتوانین کاری ئیسلامیی بکەین، بەڵام ئەوە بە تەنیا بەس نیەو دەبێ لە واقیعیش شارەزابین! بۆیە زانایانی ئیسلام دەڵێن: دادوەر و قازی یاخود موفتی دوو زانیاریی (علم)ی پێویستن، زانیاری یەك بە حوکمی خوا (جل شأنه) وە زانیاری یەك بەو واقیعە کە حوکمەکەی بەسەردا دەچەسپێ !

گەلێك جار نەشارەزایی لە شـــەرع چەندە هەڵە بە ئینســــان دەکات، نەشارەزایی لە واقیعیش هێندە هەڵەی پێ دەکات ! بۆیە خوای بەبەزەیی بە

---

(13) وەك لە ( سیرە ابن هاشم) دا هاتووە .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ﴿قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنْ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنْ الْمُشْرِكِينَ﴾ (يوسف -108)

واتە: ئەمەیە ڕێبازی من، خەڵك بانگ دەكەم بۆلای خوا لەسەر بەرچاو ڕونیی (بصيرة)، من و شوێنكەوتوانیشم. بەرچاو ڕوونی (بصیره) بەرانبەر بەدین بە واقیع بە خەڵك و كۆمەڵگا، پێویستە لە هەمووی دا بەرچاو ڕوون و شارەزا بین .

**14. بنەمایەكی دیكەی زۆر گرنگ ئەوەیە كە كاری ئیسلامیی بە هەردووك ڕەگەز نێر و مێ دەكرێت :**

بەڕاستی من زۆرم پێخۆشە كە ژمارەیەكی بەرچاو لە خوشكەكانمان بەشداری ئەم كۆنگرەیەن، كە ئەوەش نیشانەی ئەوەیە كە خوشكەكانمان كرد و كۆش و پەرێز و بەرهەمیان هەیە! ئەوە وای لێكردوون بەم ژمارەیە بێنە نێو ئەم كۆنگرەیەوە، وە ڕەنگە هەر پەرێزی كرد و كۆشەكەیان وایان لێ بكات بچنە نێو زۆر پێگەی دیكەشەوە!

براو خوشكەكانم! ئێمە نەك لەبەر ئەوەی ئەمریكا چی دەڵێ و چی گوتوە[14]، نەخێر ئێمە لەبەر ئەوە شەریعەتی خوا ڕووی لە هەردوو لایانە ڕووی لە پیاو و ئافرەتە وەك یەك! وەك خوای كاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ سَيَرْحَمُهُمْ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ (التوبة -71)

واتە: (وە پیاوانی ئیماندار و ئافرەتانی ئیماندار دۆست و پشتیوانی یەكترن، فەرمان بە چاكە دەكەن و ڕێگە لە خراپە دەگرن)، دیارە

(14) واتە لەبارەی مافی ئافرەت و سەرجەم دروشم و شیعارەكانی دیكەیەوە كە زیاتر ناوی بێ نێوەڕۆك و دووركوژی نزیك خەسارن !!

فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە چەمك و واتایەکەیان زۆر فراوانە، چونکە چاکەو خراپە لە بواری ئیمان و عەقیدە، لە بواری فیکر،لە بواری ڕۆشنبیری،لە بواری کۆمەلاَیەتی، سیاسی، ئابووری، ئەخلاقی، هەمووی دەگرێتەوە، کەواتە ئافرەتان دەبێ وەك پیاو قۆلّی لـێ هەلّمالّن لە بژار کردنی کۆمەلّگا لە هەرچی خراپەو (منکرات)ە بیشیڕازێنینەوە بە هەرچی چاکەو(معروفات)ە!

ئنجا دەفەرموێ :(نوێژ بەرپا دەکەن و زەکات دەدەن)، نوێژ کۆلّەکەی مەعنەوی دینداریی شەخسی‌یە، زەکاتیش کۆلّەکەی مادديیەتی، (وە هەروەها پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار– فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن)، پاشان لە کۆتایی دا دەفەرموێ: (ئەوانە خوا بەزەیی پێیاندا دێتەوە بێگومان خوا زالّی کاربەجێیە).

بەڕاستی دەبێ لێرەوە ئەوە بلّێم کە ئێمە هەندێك قۆناغمان بڕیون لە بواری ڕێکردنەوە و دەرفەت دان بە خوشکان بۆ کاری ئیسلامیی، بەلاَم بە ڕاستی ماویەتی! بە تایبەت لەو ڕووەوە کە ئێمە بۆخۆمان وەك برایان قەناعەتمان بەوە هەبێ کە هاوسەرانمان، دایکانمان، خوشکانمان، کچانمان، وەك ئێمە وەك براو کوڕەکانمان لە کاری ئیسلامیی‌دا هەلّسوڕێن، چونکە ئەوانیش بەرپرسیارن بەرانبەر بەدینی خوا! دیارە ئەو مەسەلەیەش کاتێك کە تەماشای ئایەتەکانی قورئان دەکەین ڕوون و ئاشکرایە، پاشان ئەگەر سەیری مێژوو و ژیان(سیرە)ی پێغەمبەر ﷺ بکەین دەبینین هەندێك شت لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بووە. ئەگەر ئێستا بیکەین عەلمانی یەکانیش پێیان سەیرە نەك هەر خەلّکی ئیسلامیی!! پێغەمبەر ﷺ ئافرەتانی دەبردن بۆ غەزاو جەنگی ڕێی خوا، بەلاَم ئێمە زۆرجار کە جەنگ و جیهادمان هاتۆتە ڕێ بەشداریيمان بە ئافرەتان نەکردوە، کەچی عائیشەی خێزانی پێغەمبەر

فاطیمەی كچی و زۆرێك لە ئافرەتانی دیكەی مسوڵمان بەشدارییان لە شەڕی ئوحوددا كردوە، برینداریان دەرمان دەكردو ئاویان پێدەدان، جەنازەكانیان دەگواستنەوە، نان و چێشتیان بۆ ساز دەكردن! [] وە پێغەمبەر جاری وا هەبووە بۆ كـــاری گرنگ و هەســـتیار ڕاوێژ و پرس و ڕای بە یەكێـــك لە هاوسەرانی كردوە! بۆ وێنە لە صولحی حودەیبییە (أم سلمە) خوا لێی ڕازی بێ ڕۆڵێكی زۆر كاریگەری بینی، ئەوە بوو پێغەمبەری لە كێشەیەكی گەورە ڕزگار كرد بە خستنە ڕووی پێشنیارێك كە پێغەمبەریش ﷺ بە قســەی كرد وەك لە (صحیح البخاری)دا هاتوە .

كەواتە پێویســـتە ئێمە بۆخۆمان دڵنیابین لەوەی كە ئافرەتانیشـــمان بەرپرسیارن بەرانبەر بە دینی خوا ئەگەر ڕێیان لـێ‌بگرین گوناحبار دەبین، وە خوشكەكانیش پێویستە لەسەر حەقی خۆیان وەدەنگ بێن، بە تایبەتیش ئێســـتاكە خەباتی جەماوەریی و خەباتی پەروەردەو فێركردن و خەباتی هەڵبژاردن و دەنگدان هەیە، لەو شتانەش دا پیاو و ئافرەت یەكسانن، وەك گەلێك جار گوتومە: ئەگەر شەڕە تفەنگ بێ تەنیا بە پیاوان دەكرێ، بەڵام ئەگەر شەڕە دەنگ بێ بە هەردوو لایان دەكرێ، هەر بۆیە لە هەندێك ڕێپێوان و دەنگدانمان دا ئافرەتان لە پیاوان زیاتر بوون! كەواتە بۆچی ئەو وزەو توانا گەورەیە لە دەست خۆمان بدەین! خوای پەروەردگاریش ئەوەتا ڕێگەی داوەو پیاو و ئافرەتی بە دۆست و پشتیوانی یەك داناون وەك یەك كە مشوور لە كۆمەڵگا بخۆن و پاكسازیی و چاكسازیی تێدا ئەنجام بدەن !

15. بنەمایەكی دیكە ئەوەیە ئێمە دەبێ هەوڵ بدەین لەگەڵ هەموو چین و توێژەكاندا خەریك بین و ڕوومان لە هەموویان بێت:

---

(15) وەك لە (صحیح البخاری) بە ژمارە 3811 و لە (صحیح المسلم) بە ژمارە 1811 و 1812 هاتووە.

براو خوشکەکانم! لایەنە ئیسلامی یەکان گەلێك جار بەوە زۆر زیانیان لـێ کەوتووە کە تەنیا نوخبە بوون، هەرکاتێك لایەنێکی ئیسلامیی تەنیا نوخبەو توێژێك و هەڵبژاردەیەك بوو، ئاسانتر ڕێگەی لێ دەگیرێ و زیانی بەردەکەوێ! بەڵام کاتێك کە ڕوو لە هەموو خەڵك و جەماوەر دەکات، دیارە هەرشتێك بوو بە جەماوەریی و ڕووی لە هەموو چین و توێژەکان کرد زۆر بە زەحمەت بەری پێ دەگیرێت! وە ئیش و کاری پێغەمبەرانیش(علیهم الصلاه والسلام) هەر وابووە تەماشا بکەن کۆمەڵی ئیسلامیی یەکەم هەر لە سەرەتاوە: ئافرەتی تێدا بووە وەك: خەدیجە، پیاوی تێدا بووە وەك ئەبووبەکر، منداڵی تێدا بووە وەك: عەلی کوڕی ئەبوو طالب، کۆیلەی تێدا بووە وەك: زەیدی کوڕی (حارثة)، ئازادی تێدا بووە وەك ئەوانی دیکە، دەوڵەمەندی تێدا بووە و نەدار و قەرزداری تێدا بووە و بابای سـیاسـیی تێدا بوو و بابای عەسـکەریی تێدا بووە ، و بابای بازرگانی تێدا بووە و ... هتد .

کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ وابووە بۆیە ئێمەش دەبێ زۆر لێزانانە بچینە نێو هەموو چین وتوێژەکانەوە، میللەتەکەمان میللەتێکی مسوڵمانە، کرێکار، جووتیار، خوێندکار، کارمەند، خەڵکی سیاسی، خەڵکی ڕاگەیاندن، زانایان، ئەهلـی طەریقەت، عەشایەر، کەسایەتییەکان، دەبێ هەوڵ بدەین هـەموو چین و توێژەکان بگرینەوە بە کارە ئیسلامی یەکەمان، تاکو ئەوەی پێویستە کە بریتی یە لە بنکەو پێگەیەکی جەماوەری گـشـتگیر، بتوانین ئەو ئامانجە بێنینە دی .

## 16. لە کۆتاییش دا دەڵێم : ئێمە نابێ لە کاری ئیسلامیی دا بڵێین یان هەموو یان هیچ !

چونکە بێگومان ئەم قسەیە هەڵەیە، پێغەمبەر ﷺ کە کیان و دەوڵەتی ئیسلامیی دروست کرد، چۆنی دروست کرد؟ دیارە بەرد بەرد و خشت خشت بینای کردوە و لەسەر یەکی داناوە! خۆ دەوڵەتی ئیسلامیی یەکسەر لە

ئاسمانەوە دانەبەزیوە! ئێستا برا یاخود خوشکێکی وامان هەیە کە باسی هەڵبژاردن دەکرێ ئارامی لـێهەڵدەگیرێ و دەڵێ: جا چۆن دەبێ بەشداری بکەیـــن چۆن بچینە نێو ئەو بـــازاڕەوە؟! بەڵام بە کـورتـی دەڵێیــن: ئێمــــە پێغەمبـــەر ﷺ سەرمەشـــقمانە لە مێـــژووی ژیانی ئەوداو چۆنیەتــــی هەڵسوکەوت و مامەڵەی لەگەڵ دەوروبەردا وەڵامی ئەو پرسیارانەمان دەست دەکەوێ، وەك لە خاڵی دووەم دا دەیخەینە ڕوو، ئنجا وەك گوتیشمان لە کاری ئیسلامیی دا نابێ بڵێین یان هەموو یان هیچ! بەڵکو دەبێ بڵێین: لە شتێك شتێك پەیدا دەبێت بەڵام لە هیچ هیچ پەیدا نابێت!

## خاڵی دووەم : شـــێوازی کار

خوشك و برایانی بەڕێزم! لەخاڵی یەکەمی ئەم تەوەرەیەی سێیەمدا باسی بنەماکانی کاری ئیسلامیمان کرد و خوا یـــاربێ لەم خاڵی دووەمەیـش‌دا دەیخەینە ڕوو کە: چۆن کاری ئیســـلامیی بکەیـــن ؟! جارێ وەك بنچینەیەکی گشتیی دەڵێین: ئامانجی شەرعی نەگۆڕ (ثابت)ن، بەڵام شێوازی کار کاری ئیسلامیی هەمیشە بە پێی هەل‌ومەرجەکان بە پێی ژینگەو قۆناغەکان دەگۆڕێن .

ئەگەر تەماشای ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) بکەین، دەبینین وەك خوای کاربەجێ لە سوڕەتی (الاعراف)دا بۆمان باس دەکات هەرکام لە (نوح، هود، صالح ، شعیب) یەك وشە دەڵێن: ﴿ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ (59، 65، 73، 85)، بەڵام دواتر کە دێتە سەر درێژەی باس و بابەتەکانیان (نوح) جەخت لەسەر لایەنێك دەکات، وەهەروەها ئەوانی دیکەش هەریەکەیان داکۆکی لەسەر لایەنێك دەکات.

کەواتە شێوازی کار(أسلوب العمل) دەگۆڕێ بەپێی جیاوازی قۆناغەکان و جیاوازی کۆمەڵگاو ژینگەو شوێنەکان، بەڵام ئامانجە شەرعی یەکان نەگۆڕن و لە شوێنی خۆیانن .

ئنجا بۆیەش خوای بەرز و بێ هاوتا لە سورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ﴾(69)

واتە: وە ئەوانەی لە ڕێی ئێمەدا خۆماندوو دەکەن و تێدەکۆشن ڕێیەکانی خۆمانیان پیشان دەدەین وە بێگومان خوا لەگەڵ چاکە کاران دایە .

لێرەدا خوا نەیفەرمووە:(سبیلنا) بەڵکو فەرموویەتی: (سُبُلَنَا) بە کۆ واتە ڕێیەکانی خۆمان، چونکە لە هەر قۆناغەدا و لە هەر کات و شـــوێنەدا بە ڕێیەکدا و بە شێوازێك خزمەتی دینی خوا دەکرێت، مەرج نیە تەنیا یەك ڕێ بێت، بەڵکو هەرجارە ڕێیەك و هەر جارە شێواز و چۆنیتی یەك، بۆیە ئیمە دەبێ عەقڵی خۆمان زۆر فراوان بکەین بۆ شێوازەکانی کاری ئیسلامیی، نەك تەنیا لەسەر وەسیلەیەك چاومان چڕ داگرین و پێمان وابێ کە چەکمان پێ نەما، تازە ئیشمان نەما، یان ئەگەر بارەگات لە فلان شوێن نەما تازە ئیشت نەما !! کاری ئیسلامیی شێوازەکانی جۆراو جۆرن .

ئنجا سەبارەت بەم واقیعەی ئێستامان دەڵێین:

لە ڕاستی دا ئەم واقیعەی ئێستامان لە کوردستان وعێراق دا وە هەر واقیعێکی دیکەی وەك ئێستای ئێمە – بۆیە ئەوە دەڵێم چونکە هەندێك قسەمان لە براو خوشکانمان بیستوونەوە کە تێبینی‌یان هەبووە لە بەشداریی ئێمە لە هەڵبژاردنەکانی کوردستان و عێراقدا کە ئایا ئەوە دروست (جائز)ە؟ وە ئایا ئەوە زیان (مفسده)ی لە قازانج (مصلحه)ی زیاتر نیە؟! بەڵێ ئەم واقیعەی ئێستای ئێمە یان هەر واقیعێکی دیکەی وەك ئێستای ئێمە، بۆ چاککردنی و گۆڕینی – کە بێگومان لەسەرمان پێویستە چاکی بکەین و

بیگۆڕین بەو شێوەیەی کە خوا پێی خۆشە - چوار حاڵەتمان لە پێشن، ناچارین یەکێك لەو چوارانە بگرینە بەر بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵدا کردنی:

یەك : ئەوەیە کە ئەو واقیعە چونکە ناشەرعییەو بەدڵمان نیە لەبەری ڕاکەین! کە لە مێژووی پیاوچاکانیش دا شتی وامان بووە، وەك هاوەڵانی ئەشکەوت (أصحاب الکهف)کە ڕایانکرد لەبەر ئەو واقیعەی خۆیان!

دوو : ئەوەیە ڕا نەکەین بەڵام خۆی لەبەر ڕاکەین ! واتە بەهێزو چەك بە گژی دا بچینەوە و لەبەر یەکی هەڵتەکێنین!

سێ : ئەوەیە خۆمانی بەدەستەوە بدەین و تەسلیمی بین و بڵێیـن: بە هەموو شێوەیەك لە خزمەتین !

چوار : ئەوەیە لەگەڵی‌دا مەدار بکەی و بگونجێی، واتە : نە لەبەری ڕابکەی و نە بەگژی دا بچیەوە بە هێز و قوەت، نـە تەسلیمیشـی بـی بـەڵکو مودارای لەگەڵ بکەی .

جا ئایا مودارا بریتیە لە چـی؟! بە کورتی دەڵێیـن تەسـلیم بوون و موداهەنە (مداهنە) ئەوەیە تەنازول بکەی لە مەبدەئە شەرعییەکانی خۆت لە پێناو سەلامەتی خۆت دا و فشار لە نەگۆڕەکانی شەرعی خوا بکەی لە پێناو سەلامەتی خۆتدا، بەڵام مودارا ئەوەیە فشار لە ژینت بکەی لە پێناوی سەلامەتی دینت دا، با بتگرن، با نان بڕاو و دەربەدەر بی، با مووچەت ببڕن و ئەوپەڕی ژان و ناڕەحەتی بچێژی، بەڵام هەر مسوڵمان بەو هەر لەسەر ڕێی پێغەمبەر بە، خۆڕاگر و نەلەخشاو بە، ئائەوە مودارایە .

جا بابزانین لەو چوار ڕێیانە کامەیان بۆ ئەم قۆناغ و هەل و مەرجەی ئێمە ڕاستو شەرعی‌یە!

1. ڕاستە هاوەڵانی ئەشکەوت ڕایانکرد لەو واقیعەی خۆیان، بەڵام بۆچی؟! چونکە وەك بۆ خۆیان دەڵێن کە خوای پەروەردگار لێیان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ إِنْ يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ

وَلَنْ تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا﴾ (الكهف -20) ئەو كافرانەی هاوەڵانی ئەشكەوت (اصحاب الكهف) لەگەڵیان ڕووبەڕووبوونەوە دوو ڕێیان لە پێش دانابوون: یان كافریان بكەنەوە، یان بیانكوژن، كە بێگومان هیچ كامێكیشیان دروست نین، دروست نیە مل بكێشی بۆ كافر كرانەوە، دروستیش نییە مل بۆ چەقۆ ڕابگری! مادام مەجالت هەبێ بۆ ڕاكردن ڕابكەو خۆت دەرباز بكە.

پاشان هاوەڵانی ئەشكەوت كەم بوون، شەش حەوت كەس بوون، لەبەر ئەوە واقیعەكەیان پێ نەگۆڕاوە و واقیعەكەش بەسەریدا سەپاندوون كە دەبێ یان كافر بنەوە یان دەتانكـوژین، بەڵام ئێســـتا نە هێنـــــدە كەمین لە ئەشكەوتدا جێمان ببێتەوە، نە دەسەڵاتدارانی ئەمڕۆش ئەو توانایەیان بەسەرمان دا هەیە كە بە زەخت و زۆر بتوانن كافرمان بكەن!!

كەواتە دروست نیە كە لەبەر واقیعی ئێستامان ڕابكەین، هاوەڵانی ئەشكەوتیش بۆیە وایان كرد چونكە جگە لەوە هیچ ڕێگایەكی تریان بەدەستەوە نەبوو، ئەوە حاڵەتی یەكەم .

2. ئنجا ئەوە كە بە هێز و چەك بە گژ واقیع دا بچینەوەو بیگۆڕین، دەڵێین: ئەگەر گریمان ئەو هێزەمان هەشبێ دروست نیە ئەو كارە بكەین!! بۆچی؟! پێغەمبەر ﷺ لە مەككە هاوەڵانی هەڵیان پێچابوو دەیانگوت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەبێ قبووڵ بكەین؟ كافران ئاواو ئاومان لـێ دەكەن، فلانیان ئەشكەنجەدا، فیساریان كوشت ... هتد. كەچی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (لم نؤمر بالقتال) جارێ فەرمانی جەنگ كردنمان پێ نەكراوە، یان هەندێك جار دەیفەرموو: (انكم الیوم قلیل) ئەمڕۆ ئێوە كەمن، واتە كارەكەمان سەرناگرێت چونكە بنكەی جەماوەریمان بۆ پەیدا نەبووە. دیارە ئێمە ناڵێین: بەكارهێنانی هێز (قوة) هیچ كاتێك دروست نیە! كاتێـــك كە خەڵك و میللەت هەموو ئیســـلامیی دەوێ و مستێك

جەندرمە ڕێ بە ئیســـلام دەگرن! لەو حاڵەتەدا دروســـتە وەك چۆن لە (سودان) كودەتای سەربازی یان كرد، ئەگەر پێشتر زەمینەسازی یان بۆ كردبێت، هیچ ناشەرعییەكی تێدا نیە مادام خەڵكەكە هەمووی ئیسلامی بوێت، بۆچی ژمارەیەك عەسكەر بتوانن ئیرادەی هەموو خەڵك بپووكێننەوە؟! دیارە بەكارهێنانی هێزیش لە حاڵێكی وادا بۆ فەرز كردنی حوكمی ئیسلامیی نیە بەڵكو بۆ بەرگریی كردنە لە ئیرادەی خەڵكە مسوڵمانەكەو، ئەو مەسەلەیەش وەك عەمەلیات كردنی ئەو ئافرەتە وایە كە ناگونجێ بە شێوەیەكی سروشتی منداڵەكەی لێ جیا ببێتەوە.

بەڵام ئایا واقیعی ئێمە وایە؟ بێگومان نەخێر ئێمە جارێ بنكـــەو پێگـــەی جەماوەریمان بەو جۆرە نیەو جارێ خۆمـــان لە ئاستی ئەوەدا نین كە حكومەتێكی ئیســـلامیی بەڕێوەبەرین، كەواتە خۆپێـــدادان و بەرەنگاربوونەوە دروست نیەو ناگونجێ، چونكە پێچەوانەی ڕێباز(منهج) ی پێغەمبەرانە ئەوان نەچوون دینی خوا بەزۆر بەسەر خەڵكیدا فەرز بكەن، بەڵكو هاتوون خەڵكیان بۆلای خوا بانگ كردوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە مەككە دەوڵەتی ئیســـلامیی ڕاناگەیەنێ و لە مەدینـــە ڕایدەگەیەنێ، چونكە لە مەككە مسوڵمانان كەمینە یەك بوون و زۆرینەی خەڵكەكەی ئیسلامی نەدەویست، بەڵام لە مەدینە زۆرینەی خەڵك ئیسلامی دەویست، ئیدی كەمینەیەكی وەك (عبدالله بن أبی بن سلول) و پیرەكەی و كۆمەڵە بێ بڕواو دەغەڵێك نایانەوێ یا نەیانەوێ، مادام زۆرینەی ئیسلامیان دەوێ، ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ ئیعـلانی دەوڵەتی ئیســـلامیی كرد، كە دیارە ئێمە لەم هەل و مەرج و قۆناغەدا ناتوانین ئەوە بكەین، مادام وایە، ئەو حاڵەتەش بۆ ئێمە ناكرێ و دروست نیە بەرەنگاری ئەم واقیعە ببینەوە بە هێز .

3. دیاره حاڵەتی سێیەمیش بە هەموو شێوەیەك نادروستە لە لای ئیمەی مسوڵمانان، ( مداهنة) و تەسلیم بوونی ئەمری واقیع ناکرێ و نابێت، چونکە مسوڵمان دەبێ خوای لەخۆی خۆشتر بوێت، دینی لە ژینی خۆشتر بوێت، ئەوەتا خوای بەرزو مەزن ڕەخنە دەگرێت لەو کەسانەی کە تەنازول دەکەن لە بیـروباوەڕ و دینیان لە ژێر فشـــــاری ئازار و نارەحەتی داو دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ وَلَئِنْ جَاءَ نَصْرٌ مِنْ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمْ أَوَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الْعَالَمِينَ﴾ (العنكبوت – 10)

واتە: وە لەنێو خەڵکی دا کەسانی وا هەن دەڵێن: ئیمانمان بە خوا هێنا، دوایی کە لەڕێی خـــوادا ئازار و ئەشـــکەنجە درا ئەو ئـــازار و ئەشکەنجەدانەی لە لایەن خەڵکەوە پێی وەك سزای خوا وایە ، پێی وایە شتێکی زۆر گەورەیە !

بۆیە براو خوشکەکانم! من لێتان دووبارە دەکەمەوە ئەگەر گیراین بەدەستی ئەمریکا یان هەر دەسەڵاتدارێك، زوڵممان لـێبکرێ لێرە یان لە هەر شوێنێك با زۆرمان بەلاوە ئاسایی بێ و بەلامانەوە گەورە نەبێت! چیە؟! ئەوپەڕەکەی لە پێناو خوادا دەتکوژن!

بۆیە وەك لە (صحیح البخاری)دا هاتوە کاتێك (خباب بن الأرت ) دەچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و دەڵێ: (یارسول الله ألا تستنصر لنا الا تدعوا لنا) ئەی پێغەمبەر ﷺ داوای سەرخرانمان بۆ لە خوا ناکەی؟ دوعامان بۆ ناکەی کە ئاوا کافرەکان سزاو ئازارمان دەدەن؟ پێغەمبەری خواش ﷺ لەو کاتەدا لەژێر سێبەری کەعبەدا پاڵی دابۆوە زۆر تووڕە بوو ئنجا دانیشت و فەرمووی: ئێوە بۆچی خۆڕاگر نابن و ئارام ناگرن، ئەوانەی پێش ئێوە بە مشار دایان دەهێنان و بە شانەی ئاسن ئێسقان و گۆشتیان

لێك جیا دەكردنەوە ؟! وە فەرموشی خوا ئەم دینە هەر سەردەخات و بە ئاكامی دەگەیەنێت .

ئێمەش دەڵێین: خوای بەرز و توانا ئەم دینەی خۆی سەردەخا، بەڵێنی داوە ﴿لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ﴾(59)، بەڵام دەبێ خۆڕاگـــــر بین، خوای باڵادەست یارمەتی بۆ كەسانێك دەنێرێ كە شایستەی بن، ئەو كەسانەش شایستەن كە بیسەلمێنن لە ژیانیاندا خوایان لە خۆیان خۆشتر دەوێت و دینیان لە ژینیان خۆشتر دەوێ و خۆڕاگر دەبن!!

4. كەواتە دەمێنێتەوە حاڵەتی چوارەم كە بریتیە لە لەگەڵ مەدار كردن، لەگەڵی بڕۆین و بیگوزەرێنین و خۆمانی لەگەڵ بساچێنین .

لەگەڵ مەداركردن واتە تۆ زۆر شت كە پێت ناخۆشە ئارامی لەسەر بگری و لە بەرانبەری دا نەشڵەژێی، وەك پێغەمبەری خوا لەو بارەیەوە فەرموویەتی! (المؤمن الذي يخالط الناس و يصبُر على أذاهم خير من الذي لا يخالطهم ولا يصبر على أذاهم) رواه مسلم .

واتە: ئەو مسوڵمانەی كە تێكەڵی خەڵك دەكات و ئارامیش دەگرێ لەسەر ئێش و ئازارەكانیان باشترە لەوەی كە تێكەڵییان ناكات و صەبریش لەسەر ئازارەكانیان ناگرێت .

ئێش و ئازارەكانیش چین؟ برادەرانی عەلمانی لە ڕاگەیاندنەكانیـــاندا دژمان دەدوێن، ئەمریكا بە ناهەق دەمانگرێ، لەملاولا خەڵكمان بێ دادگایی كردن ڕاپێچی زیندان دەكرێ و دەهێڵرێتەوە، لەڕووی ئابووری یەوە ستەممان لـێدەكرێ لە خێر و بێر و داهاتی وڵات بێ بەش دەكرێین! بەڵام دەبێ لەسەر هەموو ئەوانە صەبر بگرین، نە ڕابكەین و تەسلیم ببین! وە نە شتێكیش بكەین كە قازانجەكەی سەری مایە بخوات و كارەكەمان بنە تۆی خۆی نەكاتەوە!! بەڵگەشمان لەسەر ئەو خۆڕاگریی و پشوو درێژی یە ئەوەیە كە خوای پەروەردگــــــار لە سورەتی (ابراهيم)دا هەموو

پێغەمبەران لە یەك شوێن کۆدەکاتەوە، دوژمنەکانیشیان لە یەك شوێن، وە لەسەر زمانی پێغەمبەران ڕووبەڕووی ناحەزەکانیان دەفەرموێ:
﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَى مَا آذَيْتُمُونَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ (إبراهيم-12)
واتە: بە تەئکید هەرچەندە ئازارمان بدەن هەر خۆڕاگر دەبین، وە با پشت بەستوان تەنها پشت بە خوا ببەستن ... لەسەرچی خۆڕادەگرن؟!

لەسەر ئازار و فشارێك کە باجی دینداریيە، خۆڕاگرتن هەر ئەوە نیە کە لە سەنگەردا خۆڕابگری، جاری وا هەیە دەبێ لە سەجدەدا خۆڕابگری، چونکە قازانجی دینی خوا لەوە دایە، جاری وایە زوڵمیشت لێ دەکرێ بەڵام دەبێ خۆڕا بگری تاکو سۆز و پەرۆشی خەڵکت بۆ بجووڵێ و خەڵك بزانێ کە تۆ کێشەیەکی حەقت هەیە! پێتان وانەبێ ئەو هەموو خەڵکەی کە دوایی دەستە بە دەستە و بە کۆمەڵ ( أفواج) هاتنـــــــــە نێو ئیسلامەوە دەنگوباسی پێشتری پێغەمبەریان ﷺ نەبیستبێ! بیستوویانە کە ئەو (محمد)ە لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی لەسەر ئەو دینە حەقە سزادراون و لە قۆناغی مەککەدا و دواتر لە قۆناغی مەدینە شەڕیان پێ فرۆشراوە، ئەو دەنگوباسە هەمووی بڵاو بۆتەوەو خەڵك تێگەیشتوە کە ئەو (محمد)ە و هاوەڵە بەرێزەکانی خاوەنی کێشەیەکی ڕەوان و هەقیان پێیە، بۆیە خەڵك دوای لاچوونی بەربەستی قوڕەیش کە مەککە ئازاد کرا دەستە بە دەستە هاتنە نێو ئیسلامەوە.

کەواتە با ئێمەش خۆڕاگر بین مادام خۆڕاگریی وصەبرەکە لە قازانج و بەرژەوەندیی کار و پڕۆژەی ئیسلامیی ماندا بێت !

ئنجا سەبارەت بە هەڵبژاردن و بەشداریی تێدا کردنی دەڵێیــن :

ئێمە هەڵبژاردن و بەشداریی تێدا کردنی بە بەشێك لە مودارات دەزانین، ئەوەش با بزانین چۆن؟ جاریێ ئەسڵ لە هەڵســوکەوتەکان (المعاملات)دا بریتییە لە رێگە پێدران و دەست کراوەیی (الإباحة)، واتە

واته مسولّمان لەو بوار و بابەتەدا مەگەر بەڵگە هەبێ لەسەر حەڕام بوونی ئەو شتە، ئەگەرنا ئەسڵ ئەوەیە ڕێی پێ درابێ ،وەك چۆن ئەسڵ لە شتان (اشیاء)دا پاكیی (طهارة)یە، یان وەك چۆن ئەسڵ لە خەڵكدا بێتاوان (براءة الذمة)یە، ئەسڵیش لە هەڵسوكەوتەكان (المعاملات)دا (اباحه)یە[16]، بە پێچەوانەی بواری خوا پەرستییەكان (عبادات)ەوە كە ئەسڵ تێیدا ڕێنەدان(منع)ە، چونكە دەبێ بەڵگە هەبێ لەسەر كردنی ئەو جۆرە عیبادەتە، بەڵام بواری (معاملات) دەبێ بەڵگە هەبێ كە ئەو جۆرە هەڵسوكەوت (معامله)ە نەكەی، لە هەموو بوارەكانی سیاسی، ئابووری، كۆمەڵایەتی، هتددا.

دیارە مەسەلەی هەڵبژاردنیش جۆرێكە لە جۆرەكانی هەڵسوكەوتەكان (معاملات) و ئەمیش ئەسڵ تێیدا ڕێ پێدران (اباحه)ە، ئایا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی كە حەرام بێت تۆ لەگەڵ خەڵكێك بەشدار بی لەوەدا كە نوێنەرێكی خۆت بنێری بۆ بەغدا یان بۆ پەرلەمانی كوردستان بۆ ئەوەی چەند قسەیەكی حەقت بۆ بكات ؟! بێگومان هیچ بەڵگەیەك لەسەر حەڕام بوونی ئەو كارە نیە، بەڵێ ئەگەر جێگرەوە (بدیل)ەكەمان ئەوە بێت كە حكومەتی ئیسلامیی یەكسەر بنیات بنێین، وادەكەین! بەڵام تۆ ئەگەر بەدیلەكەت ئەوە بێ ڕەسمییەتت نەبێ، ڕێگات نادەن تەلەفزیۆن، ڕۆژنامە، ڕاگەیاندن و پێگــەیەكت هەبێ، ئەگەر بەدیلـی بەشـــــــداریكردنی هەڵبژاردنت ئەو شتانە بێ، بێگومان شتێكی ڕوونە كە ئەوە دروستە!

چونكە هەرشتێك بەرژەوەندی (مصلحة)ی زیاتر بوو لە زیان (مفسدة)ی لە بواری هەڵسوكەوتدا ئەوە تۆ دەست كراوەی لە ئەنجامدانیدا، مەگەر

---

(16) (الأصل في المعاملات الأباحة)، ئەوە بنچینەیەكی شەرعییە تێكڕای شەرعزانان لەسەری پێكهاتوون و (ابن تيمية) لە كتێبی (القواعد النورانية الفقهية )دا جوان ڕوونی كردۆتەوە .

دەقێکی شەرعیی لەسەر شتێکی دیاری کراو هەبێ، ئەو کاتە حوکمەکەی جیایە .

ئنجا ئێمە دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ سوودی بینیوە لە چەندین ڕێو ڕەسم و ڕێساو دەزگا کە لە سەردەمی نەفامی‌دا هەبوون :

1- کە یەکێکیان پەنادان (جوار)ە، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ شاری طـائف و لەوێ دەریان کرد ، هات ویستی بچـێتەوە بـۆ مەککـە سـەرانی کـافری قوڕەیش نەیانهێشت بچێتەوە بۆ نێو شار، ئەوە بوو داوای لە (مطعم بـن عدی) کرد فەرمووی: ئەگەر پەنام بدەی دێمە ژێـر پـەنا(جوار) ی تـۆ، ئەویش گوتی پەنات دەدەم، جا مطعم بڵاوی کردەوە گوتی: ( لقد أجَـرْتُ محمداً ) (محمد)م پەنا داوە دەبێ بێتەوە نێو شار و نابێ هـیچ کەسـێکیش دەستدرێژی بکاتە سەر، ئەبووسوفیان پێی گوت: ئایا (محمد)ت پەنا داوە یان نا؟ گوتی بەڵێ پەنام داوە، ئەبووسـوفیان گـوتی: کەواتـە حـەقمان بەسەری یەوە نییە! پێغەمبەر ﷺ پەنای بردۆتە بەر کابرایەکی هاوبەش پەیداکەر ( مشرك) بە پێی ڕێسایەك کە لە نێویان دا باو بووە، مانـای ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ سوودی بینیوە لە عادەت و نـەریت و یاسـایەکی سەردەمی نەفامیی تاکو بەرژەوەندی (مصلحة)یەکی پـێ بێنێتـە دی و زیان(مفسدة)ێکی پێ لە خۆی دوور بخاتەوە، کە دیارە بەرژەوەندی یەکـە ئەوە بوو بێتەوە نێو شار و قۆناغی بانگەواز لەگەڵ خەڵکەکـەدا تـەواو بکات، زیانەکەش ئەوە بووە کە ڕێگـای نـەدەن بێتـەوە نێـو جـەماوەرو خەڵکەکەی لە شاردا .

2- جگە لەوەش دەبینین (أبو طالب) دیفاعی لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد لـە مەککە، وەك لە چەندین فەرمایشتی ( صحیح)دا هاتوە (أبـو طالـب) هەتا مردیش شایەتمانی نەهێنا، ئەوە بوو کاتێـك پێغەمبـەر ﷺ پێـی فەرموو: تەنیا بڵێ (لا اله الا الله) شەفاعەتت بۆ دەکەم، گوتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە ئافرەتانی قوڕەیش گاڵتەم پێ بکەن و بڵێن: ئـەبو

طاب له مـردن ترسـاوه دڵـی تـۆم بـەوه خـۆش دەكـرد! وەك (مسـلم) گێڕاویەتەوه بەڵام ئەبو طالب و خزمەكانی وەك خزمایـەتی هـەتا مـرد دیفاعی له پێغەمبەر كرد.

بەڵێ له قۆناغی مەككەدا شمشێرەكانی بەنی هاشم ( سیوف بنـی هاشم) پارێزگاری یان له (محمد) ﷺ و ڕێبازەكەی دەكرد بـه پاڵنـەری تیرەگەریی هەرچەنده كافریش بوون، تەنانەت لـه كـاتی دەنـگ لێـبڕین (مقاطعة) و دەركرانی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانیشی دا بۆ شیوەكانی ئەبو طالب (بنو هاشم) به كـافر و مسـوڵمانەوه لەگـەڵیان چـوون! كەواتـه پێغەمبەری خوا ﷺ سوودی لەو عادەته نەفامییەش وەرگرت بۆ كـاری ئیسلامیی خۆی!!

3- پاشان پێغەمبەر ﷺ كه دەچێ بۆ مەدینه لەگەڵ جوولەكـه(یهود)كان دادەنیشێ و بانگیان دەكات كه وەرن با شتێك پێكەوه بنووسین كه چـۆن ئەم وڵاته بەڕێوه بەرین! ئیدی كۆمەڵێك خاڵیان بۆ دەنووسـێ‌و لەسـەری پێكدین و ئیمزای لەسەر دەكەن، جا ئایا ئەوه مانـــــای وابـووه كـه پێغەمبەر ﷺ دانی هێنابێت به ڕاستی دینی جوولەكەدا؟! نەخێر بەڵكو مەسەله ئەوه بووه كه بەرژەوەندی یەك هەبووه بـۆ مسـوڵمانانیش و بـۆ ئەوانیش باش‌بووه ئەویش ئەوه بووه كه چۆن پارێزگاری له مەدینه بكەن‌و لەسەر ئەو بەرژەوەندی یه كه شتێكی هاوبەشه پێكهاتوون .

4- وه له صوڵحی حودەیبیه دا كه تیرەی (بنوبكر) پاڵیان دایه لای قوڕەیش و لەگەڵیان بوون به هاوپەیمان ( متحالف) تیرەی (خُزاعة)ش هاتنه نێو پەیمانی پێغەمبەر ﷺ و وای پـەیمان لەگـەڵ بەسـتن كـه هەركەسـێك هێرشی كردەسەر (خُزاعة) – كه هەتا ئەو كاته تیرەیەكی هاوبەش بۆ خوا دانەر(مشرك) بـوون – ئـەوه پێویسـته پێغەمبـەر ﷺ و مسـوڵمانان دیفاعیان لـێ‌بكەن شەڕیان لەسەر بكەن، وەك چۆن قوڕەیش دیفـاع لـه (بنوبكر) دەكات ، هەروەها فەتحی مەككەش بەو هۆیەوه بوو كه قوڕەیش

هاتن (بنوبكر)یان هان دا چوون بیست (20) كەسیان لە تیرەی (خزاعە) كوشت، پێغەمبەریش ﷺ ئەو پەیمان شكاندنەی كردە بەڵگەو پاساوی ئازادكردنی مەككە.

كەواتە: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ تیرەیەكی كافر و موشریك پەیمانی بەستوە كە دیفاعیان لێ بكات بۆچی؟ تاكو ئەوانیش دیفاعی لێ بكەن!

كەواتە: هەم وەك ئەسڵە شەرعی یەكەو هەم وەك سیرەی پێغەمبەریش ﷺ لە بواری هەڵسوكەوت (تعامل)دا دەستمان كراوەیە، تەنیا دەبێ تەماشای ئەوە بكرێ كە ئایا ئەو كارە بەرژەوەندیی زیاترە بۆ ئیسلام و مسوڵمانان یاخود زەرەرو زیان!

ئنجا براو خوشكەكانم ! ئێمە زۆرجار گیر ناخۆین لە نێوان چەند شتێكی باشدا تاكو باشترینیان هەڵبژێرین، بەڵكو ئێمە لەم چەرخ و ڕۆژگارەدا زۆرجار گیر دەخۆین لە نێوان چەند شتێكی خراپدا و دەبێ ورد بینەوەو كۆشش (اجتهاد) بكەین داخۆ كامە لەو شتە خراپ و نەویستراوانە زیان و خراپەی كەمترە، بە ناچاری ئەویان هەڵدەبژێرین!! زانایانیش هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن كاتێك ئینسان لە نێوان دوو شتی خراپ یان زیاتردا گیر دەخوات پێویستە كامیان خراپەو زیانەكەی كەمترە ئەویان هەڵبژێرێ وەك بنچینەیەكی شەرعیی گوتوویانە،(اختیار اهون الشرین وأخف الضررین و أدنی المفسدتین).

## خاڵی سێیەم : پێداویستی یەكانی كاری ئیسلامیی :

خوشك و برا بەڕێزەكانم! خوا یاربێ لەم خاڵی سێیەمەدا پێداویستی یەكانی كاری ئیسلامیی و ئەو هۆكارانەی پەكی لەسەریان كەوتوە دەخەینە ڕوو، بەڵام دەرفەتی زۆرمان نیە بۆیە بە كورتی و گوشراوی بۆتان دەخەمە ڕوو:

**یەکەم : یەکەمین شت ئەوەیە کە لە نێوان خۆمان و خوادا ئاگامان لە ئیمان و تەقوا بێت :**

بەڵــێ ئێمە کاری ئیسلامییمان و هەموو جم و جوڵێکمان بریتی یە لە مامەڵەو هەڵسوکەوت لەگەڵ خوادا ( تبارك و تعالى) من ئێستا لێرە ئەم قسانە دەکەم وەك چۆن دوو ڕکات نوێژ دەکەم بۆ خوای پــەروەردگار، بەخوا دەبێ ئەم قسانەشم بۆ خواو لەبەر خوابێ ئنجا پاداشتی هەیــە، وە وەك چۆن لە نوێژەکەمدا دەگونجێ ڕیابازی بکەم لەمەشدا هەر دەگونجــێ بیکەم!

ئێمە کاری ئیسلامییمان بریتییە لــە هــەڵس و کــەوت ( تعامــل) لەگەڵ خوا، جا لە نێوان خۆمـان و خوادا دەبێ ئاگامان لە ئیمان و تەقوا بێت، چونکە خوای بەخشندە سەرپەرشــتی کــردن ( ولايــة)ی خــۆی، وە دۆستایەتی (ولاية) ی خۆی ئیسپات کردوە بــۆ کەســانێك کــە ئیمــان و تەقوایان هەیە، وەك فەرموویەتی: ﴿أَلاَ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللّهِ لاَ خَــوْفٌ عَلَــيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ، الَّذِينَ آمَنُوا وَكَــانُوا يَتَّقُــونَ﴾ (يونس 62،63) کەواتــە بــا ئاگامان لە ئیمان و تەقوامان بێت .

بڕوا (ايمان)یش حەقیقەتێکە لە دڵدا جێگیر دەبێ و بە عــەقڵ دەرك دەکرێ و بە زمان دەردەبڕدرێ و دانی پێدا دەهێنرێ و بە ئەندامــەکانیش جێبەجێ دەکرێ، پارێزکاریی ( تقوى) ش ئەوەیە کە ئینسان خۆی بپارێزێ لە هەرشتێك کە خوا پێی ناخۆشە، خواش سبحانە و تعالى بە گشتی دوو شتی پێ ناخۆشن : پێی ناخۆشە کە قەدەغە کراوەکانی بشکێنی، وە پێی ناخۆشە واجبەکانی بچوێنی!

ئەوەش هەمووی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە بە پــەروەردگارێتی خــوا ڕازی بین، وە بە نێردراوێتی محمــد ﷺ ڕازی بــین، وە بــە بەرنامەیــەتیی

ئیسلام ڕازی بین، خوا جل شأنه تاکه پەرستراو و پەروەردگارمـــــان بـێ، محمد ﷺ ڕابەر و پێشەوامانەو ڕەوانەکراوی خوایە، ئیسلامیش بەرنامەی ژیانمانە! وەك پێغەمبەر دەفەرموێ (ذاق طعم الايمـان من رضي بـالله رباً و بالاسـلام دينا و بمحمـد نبياً و رسولاً) رواه مسلم .

واتـە: هەرکەسـێك بـە پـەروەردگاریتی خـواو بەرنامـەیتی ئیسـلام و پێغەمبەریتی و ڕەوانە کراویتی (محمد) ﷺ رازی بووبێ تام و چێژی ئیمانی چێشـتوە.

## دووەم : لە نێوان خۆماندا برایەتی و دۆستایەتی بپارێزین :

دیـارە هـەرکات پەیوەنـدی نێـوان خۆمـان و خوامـان چـاك كـرد، پەیوەندیی نێوان خۆمان چاك دەبێت ! وەك خوا – جل شأنه – دەفەرموێ ﴿ فَاتَّقُوا اللّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ ﴾ (الأنفال –1)

واتە: تەقوای خوا بکەن و پەیوەندی نێوانتان چاك بکەن.

برایان ، خوشکان! دڵنیا بن هەر درز و ناتـــەواوی(خلـــل) یەك لـە برایەتیماندا هەبێت، لە خوشکایەتی ئافرەتاندا هەبێت ، دەگەڕێتەوە بۆ ناتەواوی (خلل) لە ئیمان و تەقوا و پەیوەندیمان لەگەڵ خـوادا – جـل شأنه –!

مەجنوون (قیس العامري )ی ناودار لە شیعرێك دا دەڵێ:

مــررت بالديـــار ديـار ليلى فقبلت ذالجـــدار وذالجـدار

وما حب الديار شغفن قلبي ولكن حب من سكن الديار

مەجنوون دار و دیواری ئەو شوێنەی ماچ دەکرد کە لەیلای لـێ بووە، جـا دەڵـێ: خۆشەویســتی دار و دیوارەکـان لـە دڵـم دا نـەبوو، بـەڵکو خۆشەویستی ئەو کەسەی کە لەو دارو دیوارانەدا نیشتەجێ بووە!

ئەگەر ئینسان بە ڕاستی خوای خۆش بوێ پێویستە هەموو دروستکراو (مخلوق)ەکانی خوای خۆش بوێن لەو لایەنەوە کە پەیوەندیان بە خواوە هەیە و دروستکراوی خوان! ئەدی چۆن دەبێ دۆستەکانی خوای خۆش نەوێن؟!

خۆ هەر کەسێك مسوڵمان بێت تۆزێك ئیمان و تەقوای هەر هەیە و بە ئەندازەی ئەو ئیمان و تەقوایەش دۆستایەتی هەیە لەگەڵ خوادا وەك خوا- عز وجل فەرموویەتی: ﴿إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ﴾ (الانفال -34)، ﴿والله ولي المؤمنين﴾(آل عمران -68)، ﴿ اللّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ (البقرة - 257)، جا من ڕەجا و تەکلیفی برایانەتان لێ دەکەم با ئەگەر دەمانەوێ پەیوەندیی نێوان خۆمان چاکتر بێ، مسوڵمانانە تر و باشتر و شەرعی یانە تر بێ، با پەیوەندیی‌مان لەگەڵ خوا مەحکەم ترو باشتر بێ ، وە با ئەوەش بکەین بە نیشانە ئەگەر ئیمانەکەت ڕێگای پێدای غەیبەتی برایەکەت وخوشکەکەت بکەی، نەك هەر لە چوار چێوەی کۆمەڵی ئیسلامیی دا بەڵکو لە بازنەی ئۆمەتدا زەم و غەیبەتی ئەهلی ئیمان بکەی، یان بە شکستی دڵخۆش بی، بزانە کە ناتەواویی و کەم وکووڕیی ئیمانت هەیە!

زۆرجار ئێمە دەڵێین: ئەدی بۆچی فلان مسوڵمانە ئاواو ئاوامان پێ دەڵێ و غەیبەتمان دەکات و بیروباوەڕی ئاوا خراپە بەرامبەرمان! جا کاکە خۆ ئێمە پێشبڕکێ لەگەڵ یەکدی دا ناکەین لە مەیدانی خراپەکاریدا!! بەڵکو خوای باڵادەست دەفەرموێ لە مەیدانی چاکە و خوا پەرستیدا کە هۆی چوونە بەهەشتە پێشبڕکێ لەگەڵ یەکدیدا بکەن: ﴿وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسْ الْمُتَنَافِسُونَ﴾ (المطففين -26) نەك لە گوناح و خراپەکاری دا، ئەو گوناح دەکات تۆش بیکەی! دیارە برایەتی و دۆستایەتی لە نێو خۆمانداو یەکدی خۆشویستن کۆمەڵێك بەرهەم و میوەو پەرێزو شوێنەواری هەن،

بەلای کەمەوە ئەوەیە کە پێغەمبەر دەفەرموێ: (المسلم من سلم المسلمون من لسانه و يده) رواه مسلم واتە: (مسوڵمان ئەو کەسەیە کە مسوڵمانان لە دەست و لە زمانی سەلامەت بن)، ئنجا نەك هەر دەبێ سەلامەت بن، بەڵکو دەبێ لێشت بەهرەمەند بن، بە زمان باسی چاکەیان بکەی و مەدحیان بکەی، بە دڵ خۆشت بوێن، دیفاعیان لێ بکەی، دوعایان بۆ بکەی ! ئەوانە پێداویستی یەکانی کاری ئیسلامیین، ئەگەر دەمانەوێ کاری ئیسلامیی مان بەرەکەتدار و بەرهەم دار بێت و خوامان لەگەڵدا بێ با پەیوەندی مان لەگەڵ خوا چاك بکەین بە ئیمان و تەقوا، پەیوەندیمان لەگەڵ یەکتر چاك بکەین بە برایەتیو دۆستایەتی ودڵسۆزی و یەکتر خۆشویستن.

## سێیەم: تێڕوانینمان بۆ ژیانی دونیا:

ئنجا لە ژیانماندا هەمیشە ئەوەمان لە پێش چاو بێت کە ئەم ژیانە دونیاییە جێی تێدا تاقی کردنەوەیە و جێی تێدا حەسانەوە و پشوودان نیە، جێی تێدا نیشتەجێ بوون نیە، بەڵکو پردی بەسەردا ڕەت بوونە! با هەرگیز ئەو ڕاستی یەمان لە بیر نەچێ، جارجار هاوەڵان کە دەیانگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆزێك پشوو بدە، تۆزێك خواردنێکی نایاب بخۆ، وە هەروەها ... دەیفەرموو: (ما أنا في الدنيا الا كراكب استظل تحت الشجرة ثم راح و تركها)رواه مسلم.

واتە: من لە دونیادا وەك ڕێبوارێك وام لە سێبەری درەختێك دا پشوویەك دەدات و دواتر بەجێی دێڵێت.

پێغەمبەر ﷺ ئاوا بوو! بۆیە هاوەڵە بەڕێزەکانی لەوەوە فێری دونیا بەکەم گرتن و فێر قوربانی دان بوون، لە (صحيح البخاري) هاتوە کە ڕۆژێك (عمر) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: چووم بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺ

تەماشام کرد لەتکە نانێکی جۆ لەسەر ڕەفتەی ماڵەکەیان بوو هیچی دیکە نا، پێغەمبەریش ﷺ لەسەر حەسیرێك ڕاکشابوو کە شوێنی لە کەلەکەی موبارەکی کردبوو، دەڵێ منیش بە گریانەوە گوتم ئەی پێغەمبەری خوا فارس و ڕۆم هەموو لە ناز و نیعمەت دان و کافریشن، تۆش پێغەمبەری خوای ﷺ بەڵام ئاوا بەم شێوەیەی! دەڵێ پێغەمبەری خواش ﷺ کە پاڵی دابۆوە، هەستا دانیشت و تووڕە بوو فەرمووی: (او في شك انت يا ابن الخطاب ...) ئایا تۆ لە گومان دای ئەی کوڕی خەططاب؟ ئەدی نازانی خوا دنیای بۆ ئەوان داناوەو دوارِۆژیش بۆ ئێمەیە کە بۆ هەمیشە لە بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت دا دەبین؟! دنیا چیە! تاکو خوا پێغەمبەری خۆی تێدا بەهرەمەند بکات بە خۆشی و ئارەزووەکانی!

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی دونیا بایی چەندە، بە چاوی دوا ڕۆژ تەماشای دنیای دەکرد بۆیە ئەوەندە لە لای گچکە بووە وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ قَلِيلٌ﴾ (التوبة -38)

خوشکان، برایان! سوێند بە خوا مسوڵمانان کە تووشی هەڵە دەبن بە زۆری بەهۆی دنیاو خۆشیەکاتی وکەمەکانیەوەیەتی، وەك لە (أثر)[17]یك دا هاتوە کە قسەبەکی زۆر بە نرخە، گوتراوە: (حب الدنيا رأس كل خطيئة) واتە: خۆشویستنی دونیا سەری هەموو گوناح و تاوانێکە، ئێمە بە زۆری وایە کە تووشی هەڵە و لادان دێین چ دەرحەق بە یەکتر و چ لە ژیانی گشتیماندا، بە هۆی خۆشویستنی دونیاوەیە، کەواتە با ئاگامان لێ بێت و ژیانی دنیا چۆنە هەروای ببینین! دونیا هۆڵی تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنە، کەواتە با ژیانی دونیا وەك خۆی ببینین و دوارِۆژیش وەك

---

(17) ( أثـر ) چەمکێکی گشتی هەیەو هەرکام لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و قسەی هاوەڵان و ئەوانەی دوای ئەوانیش دەگرێتەوە .

خۆی، خوای بەرز و مەزنیش بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا فَرَغْتَ فَانصَبْ ، وَإِلَى رَبِّكَ فَارْغَبْ ﴾ (الانشراح -7،8)

واتە : هەرکات لە کارێك بوویەوەو تەواوت کرد بۆ ئیسلام ، دەست بە کارێکی دیکە بکە و خۆی تێدا ماندوو بکە و با ڕەغبەتت تەنها بۆ لای خواو پاداشتی بێت .

## چوارەم : لە ئیش و کارماندا دەبێ ڕاوێژ بناغەی نەگۆڕ بێ:

بەڵێ ئیشوکارمان دەبێ بە ڕاوێژ (شُورَى) بێ، چونکە خوای کاربەجێ ئیشو کاری مسوڵمانانی بەوە وەسف کردوە کە بە ڕاوێژ دەبێت، دەفەرموێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ (الشورى -38)، دیارە بەدیلی ڕاوێژیش لە هەموو ئاستەکاندا هەر لە کەسی یەکەمەوە تا ئەندام شانەیەك بریتییە لە خۆسەپاندن و دیکتاتۆریی، کاری خۆسەپاندنیش بێ بەرەکەت و بێبەرهەم و ئاماجە لە دونیاو قیامەتدا، پێغەمبەران(علیهم السلام) هەموویان هاتوون دژی دیکتاتۆری و خۆسەپاندن و دژی طاغووت و ملهوڕەکان خەباتیان کردوە، ئەو دیکتاتۆر و طاغوتانەی کە ویستوویانە قسەو بڕیار هەر هی ئەوان بێت و لەسەر وان قۆرخ بکرێ! بۆ وێنە فیرعەون خوای دادگەر لێی دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: ﴿ مَا أُرِيكُمْ إِلاَّ مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلاَّ سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾ (غافر -29) .

واتە: هەر ئەوەتان پێ دەڵێم کە بۆخۆم بە چاکی دەزانم، ئەوەی منیش دەیڵێم هەمووی هەر چاکە ، ئائەوە قسەی فیرعەونانەیە!

ئەدی قسەی مسوڵمانانە چی یە؟ ئەوەیە کە شافیعی ڕەحمەتی خوای لەسەربێ گوتوویەتی: (رأيي صواب يحتمل الخطأ رأي غيري خطأ يحتمل الصواب).

**واته: ڕای خۆم پێ ڕاستە بەڵام ڕێی تێدەچێ هەڵە بێ، وە ڕای بەرامبەرەکەم پێ هەڵەیە و ڕێشی تێدەچێ ڕاست بێ!**

**ئینسان ئەگەر بەو شێوەیە بیری کردەوە گوێ بۆ هەموو کەس دەگرێ ، خوای زاناو تواناش ئەهلی ئیمانی بەوە وەسف کردوە: ﴿ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمْ اللَّهُ وَأُوْلَئِكَ هُمْ أُوْلُوا الأَلْبَابِ﴾** ( الزمر –18)

**واته: ئەوانەی گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن بەڵام باشەکەی هەڵدەبژێرن، ئا ئەوانەن کە خوا هیدایەتی داون و هەر ئەوانەن خاوەنی عەقڵن.**

**کەوابێ: ئەوەی وانەبێ نە خوا هیدایەتی داوەو نە خاوەنی عەقڵیشە! هەرکەسێك بڵێ پێویستم بە ڕاو بۆچوونی کەس نیە ئەوە چاوی لە دیکتاتۆری و خۆسەپاندنە لە هەموو ئاستەکاندا، چونکە هەیە پێی خۆشە سەرووی خۆی پرسی پێ بکات بەڵام پرس بە خوار خۆی ناکات! پێی خۆشە بۆ سەرەوەی خۆی دیموکراسی بێ بەڵام بۆ خوار خۆی دیکتاتۆری بێ!! مەبەست لێرەدا لە دیموکراسی ڕاوێژ پێکردن و پرس پێکردنە، نەك چەمکە ڕۆژئاواییەکەی.**

**کەواتە با ئیش و کارمان بە ڕاوێژ بێ و لە ڕاوێژیش نەترسین! ئێستا ئێمە لەم کۆنگرەیەدا با هیچ لەوە نەترسین کە خوشکێك یان برایەك ڕەخنەیەك دەگرێ، پێشنیارێکی هەیە شتێکی باشمان نیشان دەدات کە ڕەنگە هیچمان عەقڵمان پێی نەشکێ، سەیر نیە! پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەردەم لە خواوە وەحی بۆ هاتوە لە جەنگی بەدردا (الحباب بن المنذر) پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ لەم شوێنە بارگەو بنەت خستوە و لێرە سوپاکەمان جێگیر بووە، ئایا ئەوە (وحي)ی خوایەو بۆمان نیە قسەی لەسەر بکەین و لێی لابدەین ( أم هي الحرب و الرأى و المكيدة) یاخود ئەوە جەنگەو بار لێدیتنەوە تەکتیکی جەنگیە و**

بۆخۆت وات پێ چاکە؟! ئەویش دەفەرموێ : (بل هي الحرب و الرأي و المكيدة)بەڵکو جەنگ و بۆچوون و بار لێدێتنەوە و تەکتیکی جەنگیە ، ئەویش دەڵێ: کەواتە ئێرە چاك نیە با بیگوێزینەوە بۆ ئەو شوێنەی دیکە!

تەماشا بکەن، ئەوە دوو شتی لێ دەخوێندرێتەوە:

**یەکەم:** پێغەمبەر ﷺ هاوەڵە بەڕێزەکانی خۆی فێر کردوە قسە بکەن، ڕاو بۆچوونیان هەبێت با پێچەوانەی ڕاوبۆ چوونی ئەویش بێت! چونکە هەر خوای پەروەردگار پێویستی بە پرس و ڕای کەس نیە پێغەمبەران (علیهم السلام) لە هەموو کەس عاقڵتر بوون، پێغەمبەریشمان ﷺ لە هەموویان عاقڵتر و لێزانتر بووە و(رحمة للعالمین) بووە، بەڵام ڕاوێژی لە هەموو کەس زیاتر بووە!

**دووەم :** ئەوە بوو پێغەمبەر بە قسەشی کرد و بارگە و بنەیان بۆ شوێنێکی دیکەی گونجاو گواستەوە و خوای پەروەردگاریش سەری خستن و جەنگەکەیان بردەوە.

کەواتە با ئێمە مەسەلەی ڕاوێژ( شوری )زۆر بە گرنگ وەربگرین، خەڵك باسی دیموکڕاسی دەکات، هەناوی دیموکڕاسی و ئەوەی کە چاك و بە کەڵکە لە دیموکڕاسیدا لە شووڕای ئێمەدا هەیە، مەسەلەی دەستاو دەست پێکردنی دەسەڵاتی سیاسی بە ئاشتی یانە، مەسەلەی هەڵبژاردن وەك کە پێغەمبەر ﷺ بە هەردووك تیرەی (أوس) و (خزرج) ی فەرموو پاش ئەوەی مسوڵمان بوون و بەیعەتیان پێدا (أخرجوا اليَّ نقبائكم ) واتە: مشوور خۆرەکانم لە نێو خۆتاندا بۆ هەڵبژێرن و دیاری یان بکەن وەك لە سیرەی (ابن هاشم) دا هاتوە، هەروەها هەر چوار خەلیفە ڕاشیدەکان ئەبوبەکر و عومەرو عوسمان و عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ) بە هەڵبژاردن بوون بە خەلیفەی مسوڵمانان، بەڵێ ئەبوبەکر پێشنیاری عومەری کرد بۆ خەلیفایەتی دوای خۆی، بەڵام ئەگەر مسوڵمانان

بەیعەت و پەیمانیان پێ نەدابایە نەدەبوو بە خەلیفە، زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، ئەوانی دیکەش زۆر ڕوونە کە مسوڵمانان بەڕاوێژی نێوخۆیان هەڵیان بژاردوون.

دیارە هەر بۆیەش مسوڵمانان ئەوەندە ڕێزیان گرتوون ولە خزمەتیاندا بوون، بۆیەش پێیان دەگوترێ خەلیفە سەر ڕاستەکان (الخلفاء الراشدون) چونکە مسوڵمانان خۆیان بە ڕاوێژ هەڵیان بژاردوون، بەڵام لە دوای ئەوان خۆسەپاندن بووە بە وەسیلەو شێوازی گەیشتنە کورسی حوکمڕانیی هەر لە (معاویة) وە تا دوایی خوا عەفووی بکات! لەوێ وە ئەو پرس و ڕاوێژ(شوری)ە لە بار براو پاشان سەری کێشا بۆ ئەوەی خەلیفەیەك وەسیەت بکات بۆ ئەوەی دوو یان سێ کوڕی خۆی لە دوای خۆی ببنە خەلیفە! بۆ وێنە(عبدالملك بن مروان) یان (هارون الرشید)!!

کەواتە هەڵبژاردنی کاربەدەستان لە لایەن خەڵکەوە قەزیەیەکی ئیسلامیی یە پێغەمبەر ﷺ وای کردوە خەلیفە سەر ڕاستەکان وایان کردوە، بەڵام ئەوانی دوای وان لایان داوە بۆیە مسوڵمانانیش تووشی ئەو هەموو نەهامەتیی و دەردەسەری یانە بوون!

ئنجا مەسەلەی ڕەخنەگرتن لە دەسەڵات لە ئیسلامدا، کێ بە ئەندازەی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکان بواری داوە بە خەڵك ڕەخنە بگرن و قسە بکەن و تێبینی خۆیان بخەنە ڕوو؟! با ئێمە بزانین ئەوەی ئەمڕۆ بە ناوی دیموکڕاسی یەوە بانگەشەی بۆ دەکرێ بە چاکتر لەوەش لە شووڕای خۆمان دا هەیە، فەلسەفە وجەوهەری دیموکڕاسیش کە بریتیە لەوەی دیاری کردنی حەڵاڵ و حەرام دەداتە دەست خەڵك، ئیسلام ئەوەی (حسم) کردوە و بڕاندوویەتیەوە کە تەنیا مافی خوایەو تەنیا خوا حاکم و فەرمانڕەوایە ﴿ إِنْ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ﴾ (یوسف –40)، ئیسلام مسوڵمانانی لە کۆڵ ئەو کێشەیە کردۆتەوە چونکە شەریعەتێك هەیە و حەڵاڵ و حەڕامی تێدا دیاری کراون، وە بەدەر لەو حەڵاڵ و حەڕامەی دیاری کراوە لە قورئان

و سوننەت دا مسوڵمانان دەستیان کراوەیـە کـە بـە پـرس و ڕاوێـژ لـە سنووری شەرع دا چۆنیان پێ باشە ئاوا بکەن!

## پێنجەم : لەگەڵ کۆمەڵگادا :

پەروەردەکردنی کۆمەڵێکی پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی:

برایان، خوشکان! ئێمە دوو شتمان پێویستن بۆ ئەوەی بتوانین لە ئاییندەدا کۆمەڵگاکەمان بگۆڕین و دەوڵەتی ئیسلامیی دابمەزرێنین خوا پشتیوان بێت، هەر چەندە وەك پێشتر گوتمان ئێمە هەر کارێکی ئیسلامیی کـە دەیکـەین ئامانجێکی شەرعی یەو دەیهێنینە دی، بەڵام، ئامانجی کۆتایی ئەوەیە کە ئێمە خەڵکی ئەم وڵاتەی خۆمان (کوردستان و عێـراق ) بکـەین بـە کۆمـەڵگاو دەوڵەتێکی ئیسلامیی! چونکە دینی خوا بۆیە هاتوە حاکم و باڵا دەست بێت و نەهاتوە بندەست و مەحکووم بێت، دینی خوا بە کەمتر لە حاکمیەت ڕازی نابێت، بەڵام بێگومان حاکمیـەتی ئیسـلام لـە میانـەی ئـیرادەی میللـەتی مسوڵماندا پیادە دەبێت و بە هێز بە سەریاندا فەرز ناکرێت، بـەڵکو دەبـێ خۆیان هەوڵی بۆ بدەن و داوای بکەن! ئەگەرنا خوای زاڵ و کاربەجێ دینی بۆ ئەوە ناردوە کە حاکم بێت وەك فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ (الفتح –28) جا ئێمە بۆ حاکمیەتی دینی خوا لە وڵاتی خۆماندا پێویستیمان بە دوو شت هەیە:

یەکەم: بنکەی جەماوەریی، پێویستە بنکەی جەماوەریی دروسـت بکـەین، دەبێ خەڵکێك هەبێ ، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی کۆچ بکات بۆ (یثرب) خەڵکی ئەو شارە هەستان نوێنەرەکانیان چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و پـەیمانی یەکـەم و دووەمـی عەقەبـەیان لەگـەڵ دا بەست، پەیمانیان پێدا و گوتیان: ئەی محمد ﷺ وەرە تۆ سـەرۆك و بـرا گەورەی ئێمە بەو شەریعەتی خوامان بەسەردا پیادە بکە، ئنجا کۆچـی

**كرد بۆ ئەوێ!! ئێمەش دەبێ بنكــە و پێگەیــەكی جـەماوەری ئــاوا بــۆ خۆمان دروست بكەین كە بۆ خۆیان نوێنەرانی مسوڵمانی خۆیان دیاری بكەن ئەوانەی كە دەیانەوێ شەریعەتی خوا پیادە بكەن.**

**دووەم : دەبێ خۆشمان پێبگەیەنین، خۆمان و كەسانێك پێبگەیەنین كــە لــە ئاستی كار هەڵسوڕاندنی ئیسلامیی دابن، ئەگەر نا جاری وایە میللەت هەمووی مسوڵمانە، بەڵام ئەگەر خەڵكێكت نەبێ لــە ئاســتی بــەرزی ئیسلامدا مشوور بخوات وكار هەڵسوڕێنێ و نەزانێ چۆن سەركردایەتی و وەزیرایەتی و ئیدارەی كاروبار بكات و نــەزانێ چـۆن پارێزگـاو شــارو شارۆچكە و گوندەكان بەڕێوە ببات، ناگونجێ ولات و خەڵك بە شێوەیەكی شەرعی یانەی شایستە بەڕێوە بچێ هەرچەندە خەڵك هەمووی مسوڵمان بێ و حاكمیەتی ئیسلامی بوێت!**

**بۆیە كوردەواری خۆمـان دەڵێن (ئیشكەرت بمرێ مشور خۆرت نــەمرێ) خەڵك زۆریان دەتوانن ئیش بكەن ، بەڵام كەمیان دەتوانن مشوور بخۆن، ئێمە ئیشمان هەر بەوەندە پێك نایەت خەڵك مســوڵمان بــێ و ئیســلامی بوێـت، بەڵكو دەبێ كەسانێكیش پێ بگەیەنین كــە بتــوانن لــە ئاســتی ئیســلامدا مشوور بخۆن ئیدارەی ولات بكەن و دوایی ئیسلام پێیانەوە ناشــیرین نــەبێ و مســـوڵمانان لەســـەریان قـــەرزدا نەبنـــەوە نەبنـــە پەڵەیـــەكی ڕەش بەســـەر ئیسلامەوە!**

**ئەوەش بەوە دەكرێ كە ئەو جۆرە كەسانە هەم كەسانێكی بەهێز (قوي) بن و هەم ئەمیندار و پاك (أمین) یش بن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ خَيْرَ مَنْ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الأَمِينُ﴾ (القصص –26)، بەهێز(قوي) بن واتە چـاك لــە ئیشەكەیان بزانن، جا هەرئیشە قووەت و توانای بواری خۆی دەوێــت، ئیشــی سەربازی كابرا دەبێ ئیشی سەربازی باش بزانێ، وەهەروەها ئیشی ڕاگەیاندن و یاسایی و دارایی و ئابووری و ..... هتد ، هەریەكە پێویستە لەو كارەی پێــی**

دەسپێردرێ تێیدا بە توانا و کارامــە و پســپۆڕ بێــت، جگــە لــەوەش دەبــێ ئەمیندار (أمین) بن و ناپاك (خائن) نەبن .

جا هەر کاتێك کەسـانێکی کارامــەو ئەمینــدار (قــوی و أمــین) مــان پەروەردە کردن کە لە ئاستی کاری ئیسلامیی دابوون و بنکەیەکی جەماوەری واش دروستکرا کە ئامادەیی ئەوەیان تێدا بێ و بڵــێن : ڕازی نــابین غــەیری ئیسلام حوکمڕانیمان بەسەردا بکات، ئەو کاتە بێگومان زەمینە دەڕەخسێ بۆ تێدا ڕاگەیاندنی کیان و دەوڵــەتی ئیســلامیی، ئــەو دەوڵــەت و حکومەتــە ئیسلامیی یەی کە هەموو خەڵك بە مسوڵمان و غەیرە مسوڵمانەوە لە ژێــر سایەی دا بەهرەمەند دەبن، بەڵکو گیانــدار و ئــاژەڵ و دارو درەختــیش لێــی بەهرەمەند دەبن، چونکە مافی هەموویان پــارێزراوە، جگــە لــەوەش خێــر و بەرەکــەتی ئاســمــان و زەوی بەســەر وڵاتــدا دەبــارێ ، وەك خــوای بەخشــندە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنْ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ وَلَكِنْ كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (الاعراف -96).

خوای پەروەردگار یارمەتیمان بدات و پشتمان بگرێ کە لە نێو خۆماناو پێکەوەش براو تەباو دۆست و پشتیوانی یەکتر بین و یەکتریمان خۆش بوێ و بە خۆشی یەکتر دڵخۆش بین و بە ناخۆشی یەکتر پەرێشان و دڵتەنگ بین و لەگەڵ خەڵدا سنگ فراوان و ڕووخۆش و زمان شیرین و لێزان بــین و لەگــەڵ دینــی خوای پەروەردگاردا دەستگرتوو بین بە پرنسیبەکان (مبادئ) ی شەرعەوە و لە بواری شێواز و چۆنیەتی کاردا عەقڵمان گەورەو کراوە بێت و واقع بین بین، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی کۆمەڵی ئیسلامیی مان بۆ بکاتە وەسـیلەیەك بــە هۆکارێك کە ئەم میللەتە مسوڵمانەمان لــە کوردســتان و عێراقــدا لــەژێر سایەی دینی خوادا بەختەوەری دونیا بێت و ســەرفراز و ڕوو ســووری دوا ڕۆژ بێت.

آمین

وصلى الله على محمد وعلى اله وصحبه أجمعين

والحمد لله رب العالمين



# وتارى پيش كۆتايى پىٚهيٚنانى كۆنگره

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمدلله والصلاة والسلام على رسـول الله محمـد والـه المهتديـن بهـداه الى يوم اللقاء .**

**براو خوشكانى بەڕێزم! بە پێویستى دەزانم كە لە دوا دواى كارەكانى ئەم كۆنگرەى يەكەمى (كۆمـەڵى ئیسـلامیى ) مانـدا ئامـاژە بكـەم بەچـەند مەسەلەيەك، كـە هەنـدێكیان داواو پێشـنیارى ئامـادە بـووانى بـەڕێزن و هەندێكیشیان هەڵقولاّوى بیروبۆچوونى خۆمن، وە هەندێكیان دەچنە قالّبـى ئەوەى كە هەندێك ڕاستى بیر خۆمان بێنینیەوە و هەندێكیشیان دەچنە قالّبى ئامۆژگارى و ڕێنمایى كردنەوە و هەندێكى دیكەشیان دەچنە قالّبى خسـتنە ڕووى وەفاو ئەمەگ و پێزانینەوە، وە من بە پوختى و گوشراوى دەیانخەمە ڕوو:**

**يەكەم : شەهیدانى سەربەرزمان – خواى بەخشەر پلەيان بەرز و بەرزتر بكاتەوە – وە بنەماڵەو كەس و كارى سەربەرزو بەڕێزیان:**

**بـە پێویسـتى دەزانم كـە وەك وەفـاو پێزانینێـك بـۆ شـەهیدانمان هەركەسەمان لە ئاست خۆيەوە چ وەك هەولێكى تاكى ،چ وەك حیزب لە میانـە(خلال)ى ئۆرگانـەكانى ( كۆمـەڵى ئیسـلامیى) ئاگامـان لـە بنەماڵـەو كـەس وكـارى شـەهیدەكانمان بێـت، بـە تايبـەتى منـداڵ و كۆرپەكانیان وە بە گشتى دايك و باب و خێزانیـان، خـزم و نزیكانیـان! چونكە لە ڕاستى دا وەفامان بۆ شەهیدەكانمان ئەوەيە كە لەگەڵ بنەماڵەو كەس و كاریان چاك بین، بەتايبـەت وەك ئامـاژەم پێكـرد ئاگامـان لـە منداڵـەكانیان بێـت، ئـەویش بـەوە كـە چـۆن بۆمـان دەكـرێ ئـەو جگەرگۆشانەى ئەو شەهیدە سەربەرزانەمان وابن ئەو ڕێگا بەرز و پیرۆزە بگرن كە بابیان گیانى خۆى تێیدا بەخت كردوە، دیسان ئەوەش وەك گوتم**

هەركەسێكمان لەبەرخۆیەوە هەڵوێستی تاكی هەبێت و وەك حیزبیش لە ڕێی ئۆرگانە پەیوەندی دارەكانەوە كەمتەرخەمی نەكرێت!

هەر لێرەوە ئاماژە دەكەم بە مامۆستا عبدالله ی قصریێ و چوار هاوەڵەكەی كە ئێمە لەم دواییەدا لەگەڵ یەكێتی نیشتیمانی كوردستان دانیشتنمان كرد، ئەو مەسەلەیە بە صوڵح كۆتایی پێ هێنرا، لەبەر ئەوە كە لە شەرع دا كەسێك ئەگەر بە ئەنقەست(عمد)یش كەسێكت لێ بكوژێ – دیارە (یەكێتی) هەمیشە هەر داكۆكی یان لەسەر ئەوە كردوە كە هەڵە ( خطأ) بووە! بەڵام ئەگە ئێمە قەناعەتمان وابێ بە ئەنقەستیش بووە – شەرع سێ ڕێی دانـاون: كوشتنەوە ئەگەر ئیسپات بێ كە ئەنقەستە، خوێن وەرگرتن، عەفووكردن واتە هەركام لەم سێ یانە بكرێ لە جوغزی شەرع دایەو دەكەوێتە سەر ئەوە كە میراتگر(وارث)ی ئەو كوژراو(مقتول)ە چۆن بە بەرژەوەندیی دەزانێ، ئێمە وەك (كۆمەڵی ئیسلامیی)و كەس و كاریشیان وامان بە مەسڵەحەت زانی ئەو مەسەلەیە بە هەڵواسراوی نەمێنێتەوە بۆیە صوڵحمان كرد! دیارە هەم هی مامۆستا عبدالله ی قصریێ و هەم هی چوار هاوەڵەكانی، خوای پەروەردگار بە شەهیدی وەرگرتبن و پلەو پایەیان بەرز و بەرزتر بكاتەوە .

دووەم : برایانی پێشمەرگە و موجاهید:

هەروەها بە پێویستی دەزانم كە لێرەوە ڕێز و تەقدیر و سوپاسی شایستە بۆ برایانی پێشمەرگەو موجاهیدمان بە گشتی و بە تایبەت دێرینەكانیان بخەمە ڕوو، چونكە بێگومان ئەم واقیعەی ئێستای كارو كاروانی ئیسلامیی مان كە لە (كۆمەڵی ئیسلامیی) دا بەرجەستە بووە بە پلەی یەكەم پەرێز و بەرهەمی خەبات و هیجرەت و جیهاد و فیداكاریی ئەوانە، خوا بە كەرەم و بەخششی بێ سنووری خۆی

کردوکۆشی ڕابردوویانی بە چاکترین شێوە قبوڵ فەرمووبێ و ڕاوەستاویی (إستقامة)و پشوو درێژیی و بەردەوامیشیان بۆ ئێستاو داهاتوو پێ ببەخشێ و هەمیشە خۆیان ئاسا ئامادەو دەست لەسەر سینگ بن بۆ جێبەجێکردنی هەر ئەرك و کارێکی ئیسلامیی کە لە لایەن قیادەیانەوە پێیان دەسپێردرێ .

سێیەم : ڕێکخستنەکانمان :

دیسان بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاس و ڕێز و تەقدیر بۆ کادیرانی دڵسۆزو خۆڕاگرو بە مشووری ڕێکخستنمان بخەمە ڕوو بە تایبەت ئەوانەیان کە لە قۆناغو هەل ومەرجە سەخت و دژوارەکان دا کۆڵنەدەرانە و بوێرانە سەرگەرمی کاروچالاکی خۆیان بوون.

ئاشکراشە کە ڕێکخستنەکانمان ڕەگ و ڕیشە و بناغەی کارو بوونمانن خوا بەرەکەت و هێز و پێزی زیاتر و چاکتر بخاتە کاروباری دڵسۆزانی ڕێکخستنەوەو بە چاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوە.

چوارەم : دەربارەی زیندانی یەکانمان:

لە ڕاستی دا کێشەی برا زیندانی یەکانمان گرفت و گرێیەکی گەورەیە لەسەر دڵمان، بە تایبەت ئەوانەمان کە لە دەڤەری لای پارتی گیراون ! بۆ ئەوەی هەموو لایەکیشیان بزانن من بۆ خۆم بە شەخسی تا ئێستا دوو جار داوام لە کاك (مسعود بارزانی) کردوە، جارێکیش لە مەکتەبی سیاسی یان، برایانی دیکەشمان لە هەولێر بە تایبەتی (مامۆستا حسن بابکر) وەك بەرپرسی مەڵبەند جار لە دوای جار داوایان لەو بەرپرسانەی پارتی کردووە کە

چاویان پێیان دەکەوێ، وە هەروەها لە پەرلەمانیش هەمیشە برایانمان لەگەڵ کەسانی پەیوەندی دار باسیان کردوە وە باسیش دەکەین بەڵام حەیفێ تا ئێستا هیچمان لێیان چنگ نەکەوتوە! دیارە جگە لەو شتانەش کە باس کران هەر هەنگاوێکی دیکە بە پێویست بزانرێ دەیگرینەبەر لە پێناو ڕزگار بوونی ئەو برایانەمان، کە ئێمە دڵنیاین بە زوڵم گیراون، چونکە ئێستا نە دادگایی کردنیان دیارە، نە تۆمەتەکانیان لەسەر ئیسپات کراوە ! هەوڵدانیش بۆ ڕزگار بوونیان بە ئەرکێکی شەرعیی سەرشانی خۆمانی دەزانین، وە تا ئێستاش ئەوەی لەدەستمان هاتوە کردوومانە .

**پێنجەم: سەبارەت بە مووچەی نوێنەرانمان لە ئەنجومەنی نیشتیمانی عێراق و پەرلەمانی کوردستان و ئەنجومەنی پارێزگاکان:**

ئەوەش بە پێویستی دەزانم ئاماژەی پێ بدەم، چونکە جار جار بەر گوێمان دەکەوێ و باس لە مووچەی ئەو ئەندامانەمان دەکرێ، وەك ئاگادارن ئێمە (2)[18] نوێنەرمان لە ئەنجوومەنی ئیشتیمانی عێراق و (6) نوێنەرمان لە پەرلەمانی کوردستان و(4) نوێەرمان لە ئەنجومەنی پارێزگاکان دا هەن، هەموو نوێنەرانمان ئەو مووچەو یارمەتی یەی کە وەری دەگرن تا ئێستا هێناویانە بۆ دەستەی کارگێڕی و مەکتەبی سیاسی، ئیدی ئەویش بە بڕیاری سەرکردایەتی چەندەی بە پێویست و گونجاو زانیبێ گێڕاویەتەوە، چەندەشی بە شایستە زانیبێ تەسلیمی خۆیانی کردۆتەوە، نەك یەکسەر ئەو نوێنەرانە بیخەنە گیرفانی خۆیانەوە!

(18) خولی پێشوو وابوو بەڵام ئێستا بەس ( تەنها) نوێنەرێکمان هەیە .

ئەوەندەی منیش ئاگادارم ئەو براو خوشکە نوێنەرانەمان لەو شوێنانەی کە لێی هەن بە پێی توانای خۆیان و بەپێی ئەو هەل و مەرجەش کە بۆیان ڕەخساوە قسەی حەقیان کردوە و ڕۆڵی خۆیان بینیوە، ئومێدیش دەکەین لەمەودوا هەل و مەرجیان بۆ لەبارتر بێ (ان شاء الله) ڕۆڵی خۆیان زۆرتر و چاکتر ببینن.

وەجێی خۆیەتی ئاماژە بەوەش بدەم کە بەڕاستی نوێنەرانمان لە بەغدا کاریگەریی باشیان بووە لەسەر هەندێك بڕگەو بڕیار لە کاتی نووسینەوەی ڕەشنووسی دەستووردا، هەروەها لە پەرلەمانی کوردستانیش دیسان نوێنەرانمان لە لیژنە پەیوەندی دارەکان قسەی هەقیان کردووەو ڕۆڵیان هەبووە، کە یەکێك لە هەڵوێستەکان ئەوەبوو ئێمە وەك (کۆمەڵی ئیسلامیی و یەکگرتووی ئیسلامیی) نارەزایی نامەیەکمان تەسلیمی سەرۆکایەتی پەرلەمان کرد- لەبەر ئەوەی لە ڕەشنووسی دەستووری کوردستاندا باسی ئیسلام نەکراوەو باسی ئەوە نەکراوە کە شەریعەتی ئیسلام بناغەی یاسا دانانە- گوتوومانە ئەوەی لە دەستووری عێراقدا سەبارەت بە ئیسلام هاتوە لانی کەم ئەوەندەش لە دەستووری کوردستاندا نەبێ ، ئێمە دەنگی پێ نادەین .

**شەشەم: بەشداریی کردن لە ( لیستی هاوپەیمانی کوردستان ) :**

دیارە ئێمە بڕیارمان داو ئەوە بوو هەر لەم کۆنگرەیەشدا بە ئیجابی دەنگی لەسەر دراو پەسند کرا کە ئێمەش لەو لیستە دا بەشداریی دەکەین، بە درێژی باسمان کرد کە لە ڕووی شەرعی یەوە ئەو مەسەلەیە لە جۆری مامەڵەو هەڵسوکەوتەکانە، سەبارەت بە ( باب المعاملات) یش ( ابن القیم الجوزیة ) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە کتێبی (اعلام الموقعین) لە

(ابن عقيل)ەوە نەقڵ دەكات – زانايانی دیكەش باسیان كردوە – دەڵێ لە بواری هەڵسوكەوتەكان (معاملات)دا تەماشای قازانج (مصلحة) و زەرەر (مفسدە) دەكرێ! وە دەڵێ: لەو بوارەشدا شەرعیی بوون ئەوە نیە كە دەق (نص)ێكی شەرعیی لەسەر بێ، بەڵكو شەرعیی بوون ئەوەیە كە پێچەوانەی دەقێكی شەرعیی نەبێ و قازانج (مصلحة)یشی تێدا بێت !

واتە مەرج نیە بۆ شەرعیی بوونی مەسەلەیەك لە بواری هەڵسوكەوت دا حەتمەن ئایەت و فەرموودەی لەسەر بهێنرێتەوە، بەڵكو گرنگ ئەوەیە پێچەوانەی ئایەت و فەرموودەیەك نەبێ و قازانج و بەرژەوەندی یەك دەستەبەر بكات! كەواتە لە ڕووە شەرعییەكەیەوە ئێمە بە شتێكی ئیجابی و ڕەوای ڕوون و ئاشكرای دەبینین.

دەمێنێتەوە لە ڕووی واقیعەوە، لەو ڕووەشەوە ئێمە كۆمەڵێك پاساو و بەڵگەمان هەبووە كە بەشداری كردنمان پێ (أهون)تر بووە، چونكە ئێمە ویستمان لیستێكی ئیسلامیی هەبێت، بەڵام ئەوەمان بۆ نەڕەخسا، ئەوە بوو برایانی (یەكگرتوو) بۆیان نەگونجا لەگەڵماندا لیستێكی ئیسلامیی پێك بهێنین! ئیدی ئێمە ئەوەمان بە گونجاوتر زانی كە لەو لیستە كوردستانی یەدا بین نەك بە تەنیا دابەزین، لەبەر ئەوە من لێرەوە ڕایدەگەیەنم هەركەسێك خۆی بە ئەندام و لایەنگری كۆمەڵی ئیسلامیی دەزانێ پێویستە بیستن و فەرمانبەریی (سمع و طاعة) ی هەبێ بۆ سەركردایەتی خۆی! دیارە ئەو سەركردایەتی یە پەیمانی داوە بە لیستی هاوپەیمانی كوردستانی كە لە بەرانبەردا ئەندامێكی مسۆگەر و ئەندامێكی یەدەگ (احتیاط)مان بۆ دانراوە، لەبەر ئەوە پێویستە دەنگ بەو لیستە بدرێ، مانای وایە ئەو كەسەی دەنگی بەو لیستە نەدا گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەریی بۆ قیادەی خۆی نەبووە و بێ بەڵێنیش كراوە لەگەڵ

لایەنی بەرانبەردا، کە بێگومان هەرکام لەو دووانەش هەڵەو ناشەرعیی یە!

سەبارەت بە برایانی (یەکگرتووی ئیسلامیی)ش، ئەوەندەتان پێ دەڵێم کە ئێمە ئەوانیش و هەر مسوڵمانێکی دیکە بە برای دینی خۆمانی دەزانین، وە بە خۆشیی خۆشحاڵین و بە ناخۆشیی ناخۆشحاڵین، بەڵام پێمان وایە کە ئێمە زیاتر دەستپێشخەری برایەتی و تەبایی و بەدەمەوە چوونمان لەگەڵ ئەواندا کردوە ئومێدم وایە کە ئەوانیش وەڵامی ئیجابی یانەیان هەبێت بۆ ئەو هەموو دەستپێشخەری یانەی ئێمە، بەڵام من جارێکی دیکە لێرەوە ڕایدەگەیەنم کە بەڕاستی لە هیچ کەس لە ئەندامانی خۆمان قبوڵ ناکەین دەم بە خراپە بکاتەوە بەرانبەر بە برایانی (یەکگرتوو)، وە بەرانبەر بە هەر مسوڵمانێکی دیکەش، چونکە بێگومان ئێمە ئەوە لە خۆمان ناوەشێنینەوە کە زەم و غەیبەتی برای مسوڵمانی خۆمان بکەین ﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ﴾ (الحجرات -12)، هەڵبەتە نابێ ئەوەش بکرێتە پاساو کە بگوترێ کاتی خۆی برایانی (یەکگرتووی ئیسلامیی) یان فلان ئەندامیان ئێمەی بە فلان شتە تۆمەتبار کرد، یان لەسەر تەلەفزیۆن وا گوترا، یان بانگەشەیان دژی ئێمە کرد یان، یان ... هتد.

چونکە خوای بەخشەر دەربارەی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بە گشتی دەفەرموێ: ﴿ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾ (فصلت -34)

واتە: بە چاکترین (قسە و هەڵوێست) خراپەی بەرانبەر وەڵام بدەنەوە، ئنجا چ جای لەگەڵ خەڵکی مسوڵماندا! کەواتە نابێ ئەوە بکرێتە پاساو وە نابێ پێشبڕکێی خراپە کردن لەگەڵ خەڵکیدا بکەین، بەڵکو دەبێ ئەگەر خەڵك خراپەی کرد ئێمە چاکە بکەین، بێگومان ئەو کەسەش دەبیاتەوە لە دنیاو دوارۆژدا کە چاوی لە چاکەکەری یە، خوای بەخشندەش دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴾ (التوبة -120)

واته : بێگومان خوا پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات .

حەوتەم : سەبارەت بە کار و چالاکیمان لە هەندەران:

بەڕاستی ئێمە ئیش وکاری دەرەوەمان لاوازە! بێگومان خەڵکی دڵسۆزمان زۆرە لەوێ، بەڵام تا ئێستا نەمانتوانیوە وەك پێویست وزو و تواناکانی ئەو براو خوشکانەمان یەك بخەین و بخەینە گەڕ کە لە وڵاتانی دەرەوەن، وە سەربارەش دەتوانین زۆر کەسی دیکە بکەین بە ئەندام و لایەنگری (کۆمەڵی ئیسلامیی).

بۆیە من پێم وایە دەبێ هەوڵی زیاتر بدەین و مشووری چاکتر بخۆین، هەرکەسە لە ئاست خۆیەوە وەك هەوڵی تاکی، چونکە هەرکەسە خزم و کەس و دۆست و ناسیاوی هەیە، وە هەم وەك هەوڵی حیزبیش لە ڕێی ئۆرگانە پەیوەندی دارەکانەوە کاری بە بڕشت بکەین، تاکو بتوانین بە پشتیوانی خوا کارو چالاکی یەکانمان لە هەندەران چڕتر بکەینەوە و پێگەیەکی بەهێز بۆ کۆمەڵی ئیسلامیی لە دەرەوەی وڵات بنیات بنێین و چاکتر و زیاتربەو خەڵکە مسوڵمانەمان ڕابگەیەنین کە بە هەر هۆیەکەوە بووە چوونەتە ئەو وڵاتانە .

هەشتەم : سەبارەت بە دەڤەری بادینان:

بێگومان ئێمە وەك کۆمەڵی ئیسلامیی بوونمان لە دەڤەری بادینان لاوازە، لەگەڵ ئەوەشدا کە بادینان زەمینەیەکی باش وگونجاوی هەیە بۆ تێدا ئەنجامدانی کاری ئیسلامیی، خەڵکەکەی زۆر لە فیترەتی دینداری یەوە نیزیکن، پێویستە ئاوڕێکی بە پەلەی لێ بدەینەوە و ڕێکخستنەکانمان توند و تۆڵتر بکەینەوە هەوڵی کردنەوەی بنکەو بارەگا بدەین لەو دەڤەرەدا کە بێگومان ناوچەیەکی گرنگ و ستراتیژی هەرێمی کوردستانە .

**نۆیـەم : شاری کەرکوک**

وەك هەندێك لە برایانی ئەو شارەشمان ئاماژەیان پێکرد ، بـە ڕاسـتی کەرکووك عێراقێکی بچووکە ، هەموو پێکهاتەکانی عێراقی لـێ دەژی ئەوەش وا پێویسـت دەکات کە ئێمـە زیـاتر جـێ پێـی خۆمـانی تێـدا بکەینەوەو مشووری چاکتری لێ بخۆین و باشتر بە دەمیەوە بچین و توانـاو وزەی ماددی و مەعنەوی زیاتری بۆ تەرخان بکەین .

**دەیـەم : هەڵەبجە و هەورامان و شارەزوور لەگەڵ پشـدەر :**

بە پێویستی دەزانم لێرەوە وەك وەفا وەك ئەمەگێك سوپاسی خـەڵکی ئیسلام پەروەری هەڵەبجەو هەورامـان و شارەزوور بە گشتی بکـەین، کـە چەند ساڵێك بوو ئەم کاروانە ئیسلامیی یە لە باوەشی پڕ هەست و سۆزی خەڵکی ئەو ناوچەو دەڤەرانەدا حەوابۆوە، بێگومان ئەو خەڵکە لە پەنای ئێمە دا زۆر تووشی ئێش و ژان و ناڕەحەتی کران بە ناحەق، بێ بەش کران لە زۆر شت لە زۆر خزمەتگوزاری! بەڕاستی پێویستە بـەردەوام دوعـای خێریـان بـۆ بکـەین و چـاکەکانی ئـەوانمان لـە بـیر نەچـێ وە لـە لێقەومانەکانیشماندا ئەو خەڵکە هەر خاوەن هەڵوێسـتی شـەرعییانەو مەردانە بوون ، من هیچ کاتێك لە بیرم ناچێ کە خەڵکی ئەو شوێنانە لە پێشوازی هاتنەوەشم دوای ڕزگار بوونم لە زیندانی زاڵمانەی ئەمریکا هەم بۆ ناوچەی (چیمەن ) و هەم بۆ شارۆچـکەی (سـیروان) زۆر بـە گـەرم و گوڕی بەشداری یان کرد ، دیارە پێشوازی یەکەیان لە ئێمە هـاودەنگی و هاوسۆزی و دڵسۆزی بوو بۆ ئیسلام بۆیە ئێمەش پڕ بە دڵ مەمنوونیانین!

هەروەها خەڵکی دەڤەری (پشدەر)یش کە لە کۆچبار و گواستنەوەی بنکەو بارەگاو هێزەکانمان دا زۆر بە دڵسۆزی و پەرۆشـەوە باوەشـیان بـۆ کردینەوە خەڵکمان کە ئاوارەی لای ئەوان بوو هیچ هەستیان نەکرد کە لە

مالێكی بێگانەدان، بۆیە زۆر سوپاسی خەڵكی ناوچەی پشدەریش دەكەین خوا پاداشتیان بداتەوە كە بێگومان هەر ئەوەش لــە عــادەت و نــەریتی جوامێرانەو سەخاوەتمەندانەیان چاوەڕوان دەكرا.

**یازدەیەم : دام و دەزگا حكوومیەكان :**

دیسان وەك وەفا بە پێویستی دەزانم سوپاسی هەموو ئەو دام و دەزگا حكوومی یانە بكەین كە لە بەستنی ئەم كۆنگرەیەماندا هاوكـاری یـان كردین، زۆریان لێ مەمنوونین، برادەرانی پۆلیس بە هەموو جۆرەكانیەوە، برادەرانی ئاســایش، وە زۆر سوپاســی حكوومــەتی هــەرێمی كوردســتان ئیدارەی سلێمانی دەكەین، دیارە ئەوەش یەكەم هەڵوێستی ئیجـابی یـان نەبووە و لە بواری دیكەشدا ئەو هاوكاری و دەستبار بۆگرتنانەیان هەیە، بێگومانیش هەركەسێك زیاتر هەوڵ بدات چاكە بكات و ئیجابی تر بێت پێش هەموو شتێك بۆ خۆی قازانج دەكات زیاتر لەو كەسەی كە قازانجی پێ گەیاندوە وەك چۆن سەلبی بوون و خراپــەش پــێش خــەڵك زیــان بــە خاوەنی دەگەیەنێ!

**دوازدەیەم : لیژنەی ئامادەكاری كۆنگرەو ســەرجەم لیژنــەكان و ئامــادە بووان :**

هەروەها وەك وەفایەك زۆر سوپاسی برایانی لیژنەی باڵای ئامادەكاری كۆنگرە دەكەم، وە سوپاسی هەموو لیژنەكانی دیكەش دەكــەم، لیژنــەی خزمەتگوزاری، لیژنەی ئاسایش، لیژنەی چاودێری، لیژنەی تەندروســتی خوا پاداشتی هەموو لایەكیان بداتەوە.
دیسان سوپاسی هەموو ئامادە بووانی بەرێز دەكــەم كــە هێمنانــەو جوامێرانە مامەڵەیان كرد و هاوكار بوون، دیارە هەر ئەوەش لە كادیرانی دیندار و ئیسلامیی چاوەڕێ دەكرێت.

**کۆتایی قسەکانیشم بەم چەند ئامۆژگاری یە دێنم  بە خێرایی:**

**یەکەم :** ئێمە ئەم کۆنگرەمان لە کۆتایی دایە، بە ڕاستی من یەکەباریێ خۆم بەم کۆنگرەیەمان دڵخۆشم! پێشم وایە کە ئەم کۆنگرەیەمان وەرچەرخانێکی زۆر ئیجابی لە مێژووی کۆمەڵی ئیسلامیی دا دروست دەکات، واتە وەرچەرخانێك بۆ بەرەو پێش چوون و گەشەکردنی زیاتر، وە بۆ زیاتر پیێ چەسپاندن لە واقیعی کوردستان و عێراقیشدا!!

جا کە ئێمە لە دوا دوای کار و بەرنامەکانی کۆنگرەکەمان داین، لە هەموو لایەکمان داوا دەکەم ئەو بڕیارانەی داومانن، ئەو ڕاسپاردانەی پەسند کراون، هەموو لایەکمان پێیانەوە پابەند بین، ئەوەش تەنیا بە بەندە یان بە برایانی تازە هەڵبژێردراو ناکرێت! بەڵکو بە هەموو لایەك دەکرێت، بەڵکو دەبیێ هەموو لایەکمان هەریەکە لە ئاست خۆیەوە دەستبار بگریێ، چونکە وەك لە سەرەتای قسەکانم ئاماژەم پێکر ، جاری وا هەیە ئەندامێکی حیزب لە سەرکردایەتیش دا نیە بەلام دەتوانیێ لە ئەندامی سەرکردایەتی زیاتر دەور ببینیێ، کەلێنی گەورەتر بگریێ، مەسەلە ئەوەیە چەندە خۆت ماندوو دەکەی و چەندە دڵسۆزی و چەندە بە شەرعییانەو دڵسۆزانە کارەکانت دەکەی، جا با ئێمە ئەو بڕیارانەی کە داومانن، ئەو نەخشانەی کەکێشاومانن، هەموومان هاوکار و دەستبارگری یەکتر بین، بۆ ئەوەی کە پراکتیزە (تطبیق)یان بکەین.

**دووەم :** ئامۆژگارییەکی دیکەم پێشیێ بۆ خۆم ئنجا بۆ هەموو لایەك ئەوەیە کە ئەگەر دەمانەویێ ئیسلام لە کوردستاندا لە دڵی خەڵکدا، لە بەرچاوی خەڵك گەورەو شیرین بیێ، بەرز و بەڕێز بیێ، با لە دڵ و دەروونی خۆماندا ئیمان وئیسلام گەورە بکەین، تەقوا زۆر بکەین! بە ئەندازەی ئەوەی کە ئیسلام لە دڵ و دەروونی ئێمە دا گەورە دەبیێ، لە واقیعی ژیانی

میللەتەکەشماندا گەورە دەبێت!! پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵێک (صحابی)ی بەڕێزی خۆی دەنارد بۆ شوێنێك، ئەو هاوەڵە بەڕێزە بەس بوو بۆ ئەوەی وەرچەرخانێك، گۆڕانکارییەك لە ژیانی ئەو خەڵکەدا بەرەو ئیمان و دینداری بەرەو هەموو خەسڵەت و ڕەوشتێکی بەرز و پەسند پەیدا بکات! چونکە هەرکام لە هاوەڵە بەڕێزەکان قورئانێکی زیندوو بوون !

یان وەك شاعیری گەورەی کورد (مەحوی) دەڵێ : (19) کەسێك کە دەچوو بۆ کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ وای دەزانی پێغەمبەرستانە! چونکە هەموویان عەقیدەو ئیمانی پێغەمبەر ﷺ و عیبادەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەو ئاکار و ڕەوشتە بەرز و پەسندانەی پێغەمبەریان ﷺ لە خۆیاندا بەرجەستە کردبوو!

هەر بۆیە هەرکامێك لە قوتابی و شاگردەکانی پێغەمبەر ﷺ لە قەدەرخۆی وەك پێغەمبەر ﷺ دەیتوانی ئیمان و ئیسلام و تەقواو ڕەوشتو دادگەریی و هەموو شتێکی باش فێری ئەو خەڵکە بکات کە لە نێویاندا دەژیا و نیشتەجێ دەبوو، بە شێوەیەك شوێنێکی وەك شام (معاذ بن جبل)ی بەس بوو، میسر یەکێکی دیکە یەمەن یەکێکی دیکە، وە هەروەها عێراق و هەر شوێنێکی دیکەش.

کەواتە با ئێمەش- خوا بۆمان بکات- دڵ و دەروونی خۆمان بە ئیمان و ئیسلام و تەقوا ئاوەدان بکەینەوە، خۆمان زیاتر نوورانی بکەین بۆ ئەوەی نووری ئیمان پەخش بکەین (انشاء الله) لە وڵات و مەملەکەتی خۆماندا.

---

(19) شیعرەکەی ئەوەیە :

بە نوری عەکسی پێغەمبەر ئەوەندە مونعەکیس بوو بوون

غەریبی تازە هاتوو دەیگووت : ئەم پێغەمبەرستانە !

ئنجا پێویستە ئەوەش بڵێین: بەڕاستی هەرکەسێك مەوقیعی حەساستر بێت– دیارە مەبەستم برایانی سەرکردایەتی تازەیە– دەبێ لە ڕووی ئیمانی و ڕووحی و تەقواوە لە ئاستێکی بەرزتردابێت!! هەروەك چۆن لە ڕووی ڕۆشنبیریو فیکرییەوە دەبێ ئاستێکی بەرزتری هەبێت، هەروەها دەبێ لە ڕووی ئیداریی و سیاسییەوە هۆشیاریی زیاتری هەبێت، وە دەبێ لە ڕووی ئاکار و ڕەوشتی بەرز و پەسندەوە لە خەڵکی دیکە زیاتر ڕازاوەو درەوشاوە بێت! چونکە بە ناوی گەورە گەورە نابین، بەڵکو بە نێوەڕۆکی گەورە، گەورە دەبین، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ (القلم –4)

دیارە ئەو ئاکار و ڕەوشتە بەرزەی پێغەمبەر ﷺ بەرهەمی ئیمانێکی بەرزو گەورەو تەقواو عیبادەتێکی بەرز و گەورە بووە، کەواتە ئێمەش با بە پشتیوانی خوا هەوڵدەین ئیمانێکی گەورە، تەقوایەکی گەورە مان هەبێ تا ڕەوشت و ئاکارێکی بەرز و پەسندیشمان هەبێت .

سێیەم : سەبارەت بە نێو خەڵك و جەماوەریش ئاگامان لە ڕاگەیاندن بێت، من لێرەوە دەبێ پڕ بە دڵ سوپاسی هەموو کەناڵەکانی ڕاگەیاندنمان بکەم، ڕۆژنامەی کۆمەڵ، تەلەفزیۆنەکان، ڕادیۆکان، تیپە هونەرییەکان بە هەموو جۆر و شێوەکانیەوە چونکە ئێستا زمانی گۆیای ئێمە، دەنگ و ڕەنگی ئێمە لە ڕاستی دا ئەو ڕاگەیاندنەیە، بۆیە دەبێ ئێمە گرنگی و بایەخی زیاتری پێبدەین، چ نێوەڕۆکی ڕاگەیاندن، چ شێوازەکانی، چ ئامرازەکانی، چ کەسەکانی، پێویستە خولی تایبەت بەو بوارە بکەینەوە، هەوڵبدەین ئیمکانیەتی زیاتر و ئامێری چاکتر و پێشکەوتووتر پەیدا بکەین، وە دەبێ نێوەڕۆك (محتوى)ی ڕاگەیاندنمان پەیامدار (رسالى)انەتر بێت و تەنیا بریتی نەبێت لە کات پڕکردنەوە و سۆز (عاطفة) بزواندن! دەبێ ئێمە شانۆگەریی و سروودەکانیشمان هەموو شتێکمان هەر ئامانجدار (هادف) بێت، وا بێت کە خەڵك لە خوا نزیك بخاتەوە، خەڵك لە

هەموو شتێکی باش نزیك بخاتەو، خەڵك لە چوارچێوەی شەریعەتی خوای پەروەردگار گەورە بکات و گەشەی پێ بدات و بەختەوەر بکات.

چوارەم : لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە، پێویستە گرنگی زیاتر بدەین بە چوونە نێو هەموو چینەکانی خەڵك و جەماوەر، خەڵکی، شار، لادێ، عەشایر، خوێندەوار، هەروەها زانایانی ئیسلام ئەهلی طەریقەت وە بە تایبەت چینی گەنج و تازە پێگەیشتوو بە هەردووك ڕەگەزەوە.

پێویستە ئیش لەسەر هەموو چین و توێژەکان بکرێت و لەگەڵیان تێکەڵ بین، چونکە ئێمە دڵسۆزی هەموو لایەکین و خۆشمان دەوێن و بە خۆشییەکانیان دڵخۆشین، بە ناخۆشی یەکانیان دڵگرانین، بەختەوەریمان بۆیان دەوێ ئەگەر ئاوا بمان ناسن بێگومان ئەو خەڵکە دەبنە دۆست و لایەنگر و دەستبارگری ئێمە! هەڵبەتە ئێمە خۆمان پێ چاك نیە، بەلام دەڵێین بەرنامەکەمان چاکە.

زۆر کەس کە بە ئێمە نامۆ و نائاشنایە لەوانەیە لەبەر ئەوە بێ کە بە هەڵە ئێمەی بۆ وێنا کرابێت، بۆیەش لێمان نزیك ناکەوێتەوە، بۆیە با زیاتر بچینە نێو خەڵك بەو شێوەیە کە شایستەی ئیسلام و مسوڵمانەتی یە وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ بە ڕەوشتی بەرز و ئاکار و ڕەفتاری پەسند و شیرین خەڵکی کافری مسوڵمان دەکرد، ئێمەش با ڕێ و شوێن و ڕەفتاری ئەو بگرینە بەر بۆ تێکەڵ بوونمان لەگەڵ کۆمەڵگا و دەوروبەرمان، چونکە مەخابن جاری وایە مسوڵمانی ناحاڵی خەریکە مسوڵمانیش لە دین وەردەگێرێ نەك کافر مسوڵمان بکات! ئەوەش بە هۆی هەندێك ڕەوشتی ناشیرین و نەگونجاوو هەندێك قسەی ڕەق وطەبیعەتی نابەجێ !

پێغەمبەری خوا ﷺ کابرا هاتوە بیکوژێ و (اغتیال) ی بکات، یەکێکی وەك عومەیری کوڕی وەهەب پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد فەرمووی عومەیر بۆچی هاتووی؟ گوتی: هەروا بۆ سەردانی هەندێك خزمان هاتوم، بەلام خوا بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاندوە کە عومەیر هاتوە بیکوژێ! ئنجا

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی ئەو شمشێرە چیە؟ ئەویش گوتی: جا ئەگەر ئەو شمشێرە خێری پێوە بوایە لە جەنگی بەدر سوودی پێمان دەگەیاند!! ئەویش دەفەرمویٚ: عومەیر وەرە پێش و نزیك ببەوە، ئەویش نزیك دەکەوێتەوە ئنجا پێی دەڵێ: عومەیر ئەدی لە سێبەری کەعبە (صفوان بن أمية) بانگــی نەکردی و گوتی: ئەگەر کەسێك بچێ (محمد)م ﷺ بۆ بکوژێ لە تۆڵەی کوژراوەکانی جەنگی بەدردا، تۆش گوتت: لەبەر ماڵ و خێزانم و قەرزی زۆرم لەسەرە دەنا دەچووم، ئەویش گوتی قەرزەکانت بۆ دەدەمەوە ماڵ و خێزانت بەخێو دەکەم بچۆ بیکوژە، ئایا لە سێبەری کەعبــەدا ئەو قەول و بڕیارەتــان پێکــەوە نەدا؟! عومەیریش یەکسەر مسوڵمان دەبێ و شایەتمان دێنێ، دەڵێ: سوێند بە خوا تۆ ڕەوانە کراوی خوای و خوا تۆی ئاگادار کردۆتەوە، پێغەمبەریش ﷺ دەستی بەسینەدا دێنێ و دەڵێ خوایە دڵی پاك بکەوە، پاشان عومەیردەڵێ: سوێند بەو کەسەی نەفسی‌منی بەدەستە پێش ئەوەی (محمد) ﷺ وەك دۆستێکی گیانی بە گیانی ئەو قسانەم هێندە بە ئارامی و بە نەرمی لەگەڵدا بکات هیچ کەس نەبوو لەسەر زەوی بەقەدەر (محمد) ﷺ ڕقم لێی هەڵستێ، لە کەلێنیش دابووم تا دەرفەتم بۆ بڕەخسێ و بیکوژم بە شمشێرەکەم! بەڵام دوایی بەو شێوەیە بینیم و دواندمی، کەس نەبوو لەسەر زەوی بە ئەندازەی (محمد) ﷺ خۆشم بوێت[20]!!

دەبا ئێمەش ئاوا بە ئەخلاقی پێغەمبەرانەوە بەو ڕەوشت و ڕەفتارە بەرز و پەسندەوە کە ئیسلام فێرمان دەکات لەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی خەڵك و کۆمەڵگادا تێکەڵ و ئاوێتە بین، نەك لەبەر ئەوەی کـە خـەڵك بـە چـاکمان بزانێ! بەڵکو لەبەر ئەوەی کە ئەگەر وانەبین خوا لێمـان ڕازی نابـێ چـونکە

---

(20) وەك لە (سيرة ابن هاشم)دا هاتووە .

دیمەنێکی ناشرین لە ئیسلام دەخەینە بەرچاوی خەڵك، ئاخر خەڵك چاومان لێدەکات بۆ ئەوەی ئیسلامان تێدا ببینێ بۆیە هەر هەڵسوکەوت و ڕەوشتێکمان تێدا ببینێ، هەر وتار و قسەیەکمان لێ ببیستێ کە پێچەوانەی ئیسلام بێ، خەڵك لە ئیسلام، لە شەریعەت و بەرنامەی خوا دەکەوێتە گومان و ئێمەش بەو هۆیەوە تاوانباری لای خوا دەبین.

لە کۆتاییش دا دەڵێم :

خوشکان، برایان! بەڕاستی من زۆرگەشبینم و زۆریش دڵخۆشم! چونکە ئێوە کە ئێستا لێرەن تەنیا بەشێك و ژمارەیەکن لە ئەندامان و مشوورخۆرانی کۆمەڵی ئیسلامیی و هاوێنەی دیکەشتان زۆرن، بەڵام ئەگەر هەر ئێوەش بن، هەر ئەو براو خوشکانەش بن کە ئامادەی کۆنگرەن مادام بەڕاستی لێ بنەوین، بەڕاستی ئێمە بەسین بۆ ئەوەی میللەتی مسوڵمانی خۆمان (انشاء الله) بەو شێوەیە لێ‌بکەین کە خوا لێی ڕازی بێ و بەختەوەری دونیا و سەرفرازی دواڕۆژ بێ.

من هەموو لایەکیش دڵنیا دەکەمەوە کە (انشاء الله) ئێمە سەرەنجامی چاکی دونیاشمان هەیە و سەرەنجامی چاکی قیامەتیشمان مسۆگەرە، براو خوشکەکەنم! ، ئینسان کە زۆر جار بیر دەکاتەوە ئەو خوا بەرز و مەزنە ( جل شأنە) کە ڕێگای پێداوین بیپەرستین و لێی بپاڕێینەوە و بەندایەتی بۆ بکەین، هەر ئەوە بۆخۆی گەورەترین نیعمەتە و گەورەترین بەخشش و شانازی‌یە کە خوا ڕێ بە ئێمە بدات بیپەرستین! پاشاو دەسەڵاتدارەکان دەبێ خەڵك بە چەندین واسیطە و دوای هەوڵ و ماندوو بوونێکی زۆر ئنجا دەتوانێ بچێتە

خزمەتیان کە ڕەنگە بە دەستی بەتاڵ و خاڵیش بگەڕێتەوە و هیچیشیان لێیان دەست نەکەوێ!

خوای گەورەو بەدیهێنەر لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار هەر لەسەری فەرز کردووین کە بڕۆینە خزمەتی! جگە لەوەی بەشێوەی سوننەت (تطوع) چەندە دەتوانین بۆمان هەیە لە خزمەتی دابین، خوا چەند بەخشندەیە!

جا با ئێمە خۆمان بە بەختەوەر و خۆشحاڵ بزانین کە لەسەر ڕێی پێغەمبەرین ، کە ئیماندار و خواپەرستین ، کە (انشاء الله) سەرەنجامی قیامەتمان مسۆگەرە، وە خوا یاریێ لە خزمەتی پێغەمبەران ( علیهم الصلاة والسلام ) ڕاستان و شەهیدان و صالحاندا بە دیداری خوای پەروەردگار شاد دەبین، دیارە ئەم دنیایەش خوا (جل شأنه) بە جێی تاقیکردنەوەی داناوە، ئنجا تەنیا بەوەش لە تاقیکردنەوەی خوا دەردەچین کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ بین، سوێند بە خوا هەرکەسێك لە ژیانی دنیادا لەسەر ڕێبازی خوا و پێغەمبەر ﷺ بڕوا مسۆگەر لە قیامەتیش لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دادەبێ و لە حەوزی ئەویش ئاو دەخواتەوە ولە ژێر ئالای ئەویش دا حەشر دەکرێ، وە لەگەڵ ئەویشدا دەچێتە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکانی خوای پەروەردگار وە بە پێچەوانەش بە پێچەوانەوەیە.

خوای بە بەزەیی سەرەنجامی هەموو لایەکمان خێر بکات، خوایە بە لوتف و بەزەیی و بەخشندەیی خۆت هیدایەتی زیاتر و چاکترمان بدەی، لە دین و شەریعەتی خۆت دا شارەزاترمان بکەی، لە دینداری ماندا واقیع بینتر و بەچاو ڕوونترمان بکەی، خوایە برایەتی و خۆشەویستی و یەکڕیزی و تەبایی مان لە نێو زیاتر بکەی، خوایە بە کەرەم و لوتفی خۆت لەگەڵ ئەو میللەتە مسوڵمانەی خۆمان خۆشەویستی و تەبایی مان زیاتر بکەی، خوایە ئێمە بۆ خۆمان لای تۆ چۆنین ئاوا حەقیقەتمان بەو خەڵك و میللەتەی خۆمان

بناسێنی، خوایە یارمەتیمان بدەی کە هەر شتێك قازانجی دونیا و قیامـەتی ئەو خەڵك و میللەتەی تێدایە بەو شێوەیە بڵێین و بەو شێوەیە بکەین، خوایە وامان لێ بکەی کە لە ئاستی بەرزی دینــی تــۆدا بــین، لــە ئاســتی بــەرزی پێغەمبەری کۆتایی تۆدا بین. آمین

وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

والحمد لله رب العالمين

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد الا اله الا انت استغفرك وأتوب اليك



# نێــوەڕۆك